یەهودییەت نەسرانیەت ئیسلام









# ململانێ ی شەرعیەت

نوسینی/ عبدالله گەرمیانی

١٤٣١ کۆچی ٢٠١٠ لە دایك بوون

چاپی یەکەم

# یەهودییەت - نەسرانیەت - ئیسلام
# ململانێ ی شەرعیەت

نوسینی: عبدالله گەرمیانی

١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

ناوی کتێب: یەهودییەت - نەسرانیەت - ئیسلام ململانێ ی شەرعیەت

نووسەر: عبدالله فازل حەسەن

تایپ: ئاسۆ صالح

تیراژ: ٥٠٠

چاپ خانە: سیڤا (شەقامی مەولەوی)

ژمارەی سپاردن :

بەهاوکاری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی چاپ کراوە.

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾

صدق الله العظيم(سورة آل عمران/٦٤)

ئەی ئەهلی کیتاب ( جولەکە و گاورەکان) وەرن با لەسەر ئەوەی لە نێوان ئێمە و ئێوەدایە کۆ ببینەوە ، کە جگە لە خوا کەس نەپەرستین و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین،جگە لە خوا کەس نەکەینە خوا و بڕیاردەر، نەفسەکان بڕیاردەرتان نەبن، گەر دەستتان هەلگرت، ئەوا بڵێن ئێوە شایەت بن کە ئێمەش موسڵمانین و ملکەچی خواین .

ئەمەیە پەیمانی ئاسمان بۆ هەمووان .

ناوەڕۆك

## پێشەکی

# بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

سەرەتا سڵاو لەگیانی هەموو پێغەمبەران، کە لە پێناو مانەوەی شکۆی مرۆڤەکاندا پەیامیان گەیاندوە و بە دەستی مرۆڤەکانیش چەرمەسەریان چەشتوە، داوای شکۆیی و ناسینی یەك خواییان دەکرد، کەچی لە پێناو زۆر خوایی و کڕنوش بردن بۆ مرۆڤە هاوشێوەکان، ڕووبەڕووی سەختی کوشتن و پیلانی ناحەزان دەبوونەوە

سڵاو لە تۆ موسای پێغەمبەر، بەغیرەت و بە جۆش بوو بۆ چەوساوان، خۆت خستە ترسناکیەوە لە بۆ ئەو مرۆڤانەی یاخیانە لە تەکتدا دەجوڵانەوە، بوونە زیندوو کوژی مردوو پەرست، کە مابووی لە ژیاندا خەمیان بۆ دروست دەکردی، کە کۆچیشت کرد بۆت دەگریان، گریانەکە دوو شێوە بوو، شێوەیەکیان هی ئەو کەمە بڕوادارانە بوو کە لە دەوروبەرت و گیان لە سەر دەست بوون لە بەرامبەر فرمانەکانتدا، شێوەیەکی دیکەشیان هی ئەوانە بوو جارناجارێك بۆ ئەوسزایەی بەسەریاندا دەباری لە پەروەردگارت دەپاڕایتەوە و لێخۆشبوونت بۆیان داوا دەکرد، تا کۆچکردنت هەر گەورەییەکانی خوات بیریان دەخستەوە، لە رزگار بوون لە دەستی فیرعەون و ستەمکارییەکانی، شەقبوونی نیل و خنکانی فیرعەون و بەچاو بینینی شکستی ستەمکاران و پسانی پەتی ستەمکاری، تاوەکو دەیان و سەدان گەورەیی دیکە .

سڵاو لە تۆ عیسای مەسیح، کوڕی ئافرەتە سەردارەکەی جیهان، عیسایەك کە دەیزانی ئەو گەلەی بۆی هاتووە هیچی لێ کەم نیە جگە لە پەیامی ئەخلاق، ئەخلاق لە کار و کردەوە و مامەڵەکاندا، چونکە لەو تەوراتەی کە شێوێندرا بوو هەر داپلۆسین و تۆڵە کردنەوە مابوویەوە .

سڵاو له تۆ موحەممەدی پێغەمبەر، لەوەی لە سەرەتا و کۆتادا هەر دەست پاك و گەورە بووی، ئەحمەدەکەی نێو ئینجیل و مەحمودەکەی ئاسمان، شارەزامانت کرد کە موساوعیسا (سەلامی خوایان لەسەربێ) تەنیا پێغەمبەر بوونە نەك بەو شێوەی کە یەهودیی و مەسیحیەکان کە باسی دەکەن، وەکو ئەوەی شوێنکەوتەی دوو ئاینەکە بە یەکتری ئێژنی

لەوەتەی مرۆڤ کە پێشتر بوونی نەبووە و، لە دروست بوونی ئادەمەوە خۆی ناسیووە و هاتۆتە نێو ژیانەوە، ئاین گرنگترین رواڵەتەکانی ژیانی مرۆڤ بووە و لە کۆنەوە تاوەکو ئێستاش لایەنە ژیانیەکانی کۆمەڵگە رێك و پێکدەهێنێ ، ئاین هاتووە بۆ رێکخستن و هاوسەنگ کردنی ئاستە فرە و هەمەجۆرەکانی، بۆ دوور خستنەوەی مرۆڤ لە هەڵسوکەوتە ناڕێك و وێرانکەرەکانی، تاوەکو ماف و پابەندییەکانی خۆی بناسێ و لە چوارچێوەی سنوری ئازادی خۆیدا بجوڵێتەوە ، بەوەی سنوری ئازادی خەڵکی و پەیامی خوا نەبەزێنێ و لە سروشتی خۆی نەترازێ

سەردەمەکان تێپەڕین و لە تێپەڕیندان، مێژووش بەشی خۆی تۆمار کراوە، پەیامی ئاسمانی و یەکتاپەرستیش لەلایەن خواوە هاتووە بۆ هێنانەوەی مرۆڤ بۆ لای خۆرسکی پاك و پابەند بوون بە بنەماکانی یەکسانی و رەچاوکردنی ماف لاوازان و بڵاوکردنەوەی رێز و گەورەیی و دەوڵەمەند کردنی کۆمەڵگە بە ژیانی شارستانیەت و ئاراستەکردنی ڕووە و یەکتاناسینی خوا

خوای گەورە پەیامی خۆی بۆ مرۆڤایەتی ناردووە بۆ رزگاربوونیان لە ستەمی ستەمکاران و بێ باوەڕان، کە ئامانجیان بە کۆیلە کردنی خەڵکی و خواردنی سەروەتیان و داگیرکردنی ئازادییەکانیان و سوککردنیانە لە بە خزمەتکارکردنیان

ئاین هاتووه تاوەکو شەریعەتی خوایی لە جێگەی هەموو یاسا دانراوەکانی مرۆڤ بێ و ماف و شوێن بۆ مرۆڤایەتی دیاری بکات، کۆمەڵە فرمانێکیشی داناوە بۆ پێچەوانەکارانی فرمانەکانی خوا

لە زووەوە و لەو کاتەوەی فامم کردۆتەوە و خوێندنەوە بۆتە خولیام، تامەزرۆیم بۆ ناسینی ئەم سێ ئاینە هەبووە کە سەرچاوەکەشیان یەك شتە، سەرەتا لەوەوە دەستم پێکرد کە ئاینی خۆمە و لە بوونی خوا دڵنیا بووم و لە کاری پێغەمبەران تێ گەیشتم و دەورووبەریانم بۆ روون بوویەوە، پاشان کە رۆیشتمە زانکۆ و زیاتر بەرچاو روون بووم بە سەرچاوەکان و گەڕان بە کلتووری ئاینەکان و زیاتر زەقبوونی سیاسەتی نێو دەوڵەتی و وەرگرتنی شێوەی ئاینی رووتی رووداوەکان و نزیکبوونەوەم لە قۆناغی چواری زانکۆ و ئامادەکردنی توێژینەوەی زانکۆیی ، بڕیارمدا توێژینەوەکەم لەسەر ململانێی ئاینەکان بێت، بەوەی تامەزرۆییەکم بۆ ئامادەکردن و نوسین لەسەر ئەو لایەنە هەبوو، سوپاس بۆ خوا کە وەها هەلێکی بۆ رەخساندم بۆ نوسینەوەی

یەهودییەت،نەسرانییەت ( مەسیحیەت ) ئیسلام ، سێ ئاینی ئاسمانی و یەك سەرچاوەی خوایی، بە پێی زەمەنیش بەو جۆرە هاتوون کە ریز کراون، ئیسلام دواینیانە، سەبارەت بە بابەتی ململانێش لە کاتی خۆیدا لە لێکۆڵینەوەدا مامۆستایانی سەرپەرشتیار ئەوەیان دەپرسیەوە کە بۆچی ململانێ ( صراع ) بۆ لێگەیشتن و وتووێژ نەبێ ؟ ! دیارە وتوێژ و بابەتی حیوار لە قورئاندا بوونی هەیە،عەقڵ دەجوڵێنێت و ووتوێژی لە تەکدا دەکات، بابەتە بیر و باوەڕییەکان پشکنراوە و بابەتی ململانێش هەردەم لە ئارادایە، ململانێ لەسەر ئاستی ئوممەت، دیارە بەپێی سەردەم و رۆژیش تاکەکان توانیویانە بە بنەچەی باوەڕی داوا کراو بگەن. ئەوەش لەو موخاتەبە قورئانیە وا سەرچاوەی گرتووە کە تاك بۆی رۆیشتووە و لەسەری هەڵوێستەی کردووە

خوای گەورە ئەو پەیامانەی ناردووە تاوەکو بەرنامەی پەرستنی خوا بن و سەرچاوەی ژیان بێ، بۆ ئەوەی ئەڵقەی کۆکەرەوەی مرۆڤەکان بێ لە دەوری یەك و رەنگەکان نەبنە پێوەر و هەڵسەنگاندنی گیانەکان

ئەمرۆش ئێمە لە واقیعدا دەبینین،جەنگ و ئاشتی و سیاسەت و ئابوری و بڕیار لە نێو ئەم ئاینە ئاسمانیانەوەیە، جەنگ و کاولکاریەکان، دابەشکردنی ولاتان، شوێنکەوتە و پەیامدارانی ئەو پەیامانە بڕیاری لەسەر دەدەن ترسناکی و هەڕەشە و دوژمنکارییەکان تاوەکو ئێستا بیانوو پاساوی بۆ هەیە و رەنگ و بۆیەی ئاینی کراون ، پێچەوانەی ئەوەی شەریعەتی ئاسمانی و ئامۆژگاری پێغەمبەران دەیانەوێت .

بەلام ئەوانەی بە شوێن بەرژەوەندی کەسیدا گەڕاون و دەگەڕێن دەستیان گەیاندۆتە شێواندنی دەقەکان و ژیانیان لە بەختەوەری ویستراوەوە گۆڕیوە بۆ ناڕەحی و بەدبەختی

ئەخلاق،یەکێکە لە پەیامە هەرە جەختکراوەکانی پێغەمبەران.

پێغەمبەران داوایان کردووە کۆمەڵگەکان پارێزەری خۆرسکی مرۆڤ بن و لە داوێن پیسی و دزی و دەستەمۆ کردنی مرۆڤەکانی دی دوور بکەونەوە، شەریعەتەکانیان گەیاندووە ، داوێن پارێزی،خۆ داپۆشینی ئافرەتان و سیما جوانەکانی ئاینداری داواکراو گەلێکی خواین، کەچی لە ولاتی مەسیحی نشین و لانکەی دیموکراتیەتی وەکو فرەنسا دژایەتی خۆداپۆشینی موسوڵمانان دەکرێت، لە کاتێکدا دەڵێن مرۆڤەکان پێویستە ئازادی خۆیان هەبێ، ئیباحیەت و ئەو رەوشتەی شیاوی مرۆڤ نیە و بە چاوی داوێن پیسیەیەوە دەڕوانرێتە ئافرەت و هەموو ئەوانە لە سایەی ئازادی مەسیحی کۆمەڵنشیندا رەوایە، کەچی ئەوەی موسڵمان یاساغ و زەقکردنەوەی جیاوازی ئاینییە !

که له ( ۲۰۰۳ – ۲۰۰٤ ) ئەم لێکۆڵینەوەیەم بە زمانی عەرەبی پێشکەشی بەشی توێژینەوە ئیسلامیەکان ( کە بەشێکی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانیە و وا ئێستا لە نەماندایە ( انقراض ) !) کرد ، نیازم هەبوو لە کتێبێکدا لە چاپی بدەم و بە کوردیەوە بیخەمە بەردەستی خوێنەران ، بە تایبەتی ئەو نەوەیەی بەرێوەیە و تەنیا رووی دوژمنکارانە دەبینن لە لایەن ئاینزاکانی رۆژئاواوە و ناخی ئاینەکە ناناسن ، ئەو رووە دەبینن کە وێنەی کاریکاتێری پێغەمبەرەکەیان دەکێشرێ و هەست و سۆزیان بۆ گڕ دەگرێت، لە سیفەت بەرزی و دامەزراویشیاندا بەرامبەر پێغەمبەرانی جولەکە و گاورەکان هیچ هەڵوێستێکی خراپیان نابێ، ئەوەش پەروەردەیەکی قورئانیە بۆیان و هەموو پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسەر بێ) دژ بە وەها ئەخلاقێکن کە لەوەها کۆمەڵگەیەکی دوور لە خوای راستەقینە دەوەشێتەوە

لەگەڵ زیاتر بلاّو بوونەوەی ئیسلام لە رۆژئاوادا، زیاتر سنوری موسڵمانان دەکێشرێ، وەکو ئەوەی لە سویسرا منارەی مزگەوتەکان یاساغ دەکرێ وله دژی وەها رێو شوێن گرتنێك تەنانەت هەندێ رێکخراوی مرۆڤ دۆست دژ بەو بریارە ناڕەزایی دەردەبڕن

ئەوەی ماوەتەوە ئاماژەی پێبدەم، ئەوەیە ئەم کتێبە لە دوو تەوەر پێك هاتووە کە هەر یەکە لە چەند بەشێك پێکهاتووە بە سود وەرگرتن لەچەند سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە بە ئەنجام گەیاندراوە و لە تەوەرەی یەکەمدا لەبارەی ماهیەتی ئاینەکانەوەیە و لە پێنج بەش پێك هاتووە :

بەشی یەکەم : پێناسەی ئاین لە رووی زمان و زاراوەوە

بەشی دووەم : ململانێ و حیکمەتی خوایی

بەشی سێیەم : تایبەتە بە ئاینی جولەکە و لە دوو باس پێك هاتووە ، باسی یەکەم کورتەیەکی مێژووی بەنوئیسرائیلە و ، باسی دووەمیش لە بارەی یەهودیەت و دروست بوونێتی

بەشی چوارەمیش لە بارەی ئاینی نەسرانیەتەوەیە( مەسیحیەت - گاوری ) و دوو باسە، باسی یەکەم لە بارەی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێ ) و ئینجیلەوە٠، باسی دووەمیش نەسرانیەت دوای عیسای پێغەمبەر ( سەلامی خوای لە سەر بێ ) ٠

بەشی پێنجەمیش لە بارەی ئاینی ئیسلامەوەیە و لە سێ باس پێك هاتووە ، باسی یەکەم لە بارەی شەریعەتی خواییەوەیە پێش ئیسلام ، باسی دووەمیش تایبەت بە بانگەوازی موحەممەد ( صلی الله علیە وسلم ) لە تەورات و ئینجیلدا ، باسی سێ یەمیش تایبەتە بە دەرکەوتنی ئیسلام و هەڵوێستی ئەهلی کیتاب ( جولەکە و نەسرانیەت ) ٠

تەوەری دووەم لە پێنج بەش پێکهاتووە و تایبەت بە ململانێکان و پاساوەکانە :

بەشی یەکەم لەبارەی ململانێی ئەخلاقیەوەیە و دەبێتە دوو باس، باسی یەکەم ململانێی ئەخلاقی بۆچی ؟

باسی دووەمیش لە بارەی ئامرازەکانی ململانێ ی ئەخلاقییەوەیە. بەشی دووەمیش لەبارەی ململانێی فیکرەوەیە و دەبێتە دوو باسەوە ؛ باسی یەکەم ململانێی فیکرییە، دووەمیش شێواندنی ناوخۆییانەی فیکری موسڵمانانە.

بەشی سێ یەمیش لە بارەی ململانێی دەسەڵاتەوەیە و بۆتە دوو باسەوە، باسی یەکەم ململانێی سەربازی و باسی دووەمیش ململانێی سیاسیە

بەشی چوارەمیش لەبارەی فەلەستین و دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلەوەیە

بەشی پێنجەم و کۆتایش لە بارەی زیندوویەتی ئیسلام و بەچەقبوونی هێرش کردنە سەرێتی، لە پاشاندا دەسهاتێك(کۆتایی) هاتووە.

داواکارم لە خوای گەورە یارمەتیدەر و سەرخەرمان بێ لە گەیاندنی ئەو نیەتەی، کە جگە لە بەرگریکردن لە راستی و شکۆی پێغەمبەرەکانی هیچی دیکەمان مەبەست نەبووە، بە هیوام خزمەتێك بێت و کردبێتم و سوپاسی ئەو هاورێیانەشم دەکەم کە لەکاتی خۆیدا پەرۆشانە سەرچاوەیان بۆ پەیدا کردم و ئەو بەرێزانەش کە هاندەر بوون بۆ بەچاپ گەیاندنی..

عبدالله فاضل حسن - گەرمیانی
رزگاری - صمود - ١٣ / ١ / ٢٠١٠ لە دایك بوون

# تەوەری یەکەم

بەشی یەکەم : ئاین لە رووی زمان و زاراوەوە

بەشی دووەم : ململانێ و حیکمەتی خوایی

بەشی سێ یەم : ئاینی جولەکە .

بەشی چوارەم : ئاینی نەسرانیەت ( مەسیحیەت – گاوری ) .

بەشی پێنجەم : ئاینی ئیسلام .

## بەشی یەکەم :

ئاین ( دین ) لە رووی زمانەوانیەوە :

لە " قاموس المحیط " لە بارەی زاراوەی ( دین )ەوە هاتووە : دان : یدین : عزَّ ، و ذلَّ ، و طاعَ ، و عصی ، و اعتاد خیراً او شراً ،

واتا: شکۆمەندی نواند، ملکەچی کرد، گوێڕایەڵی کرد، سەرپێچی کرد، چاکەیەکی یان خراپەیەکی بە نەریت کرد ، ( أدَان ) ە ش بە واتای کڕین بە قەرزە یان فرۆشتن بە قەرزە، واتا ( دَین ) بە ژێرە( کسر ) ە ی پیتی ( دال) [1] هەروەها لە فەرهەنگی ( المختار الصحاح ) دا لە بارەی ( دینەوە ) بە واتای نەریت ( عادەت ) و کار و بارەوە هاتووە : الکیس من دان نفسه و عمل لما بعد الموت . دەبینین کە ( دانَ ) فیعلە و لەوەوە وشەی ( دین ) داڕێژراوە و بە جڵەو کردن و کارِ ڕێکخستن هاتووە و واتای فەرموودەکەش ئەوەیە : ژیر و فامیدە ئەو کەسەیە جڵەوی دەروونی خۆی دەکات و بۆ مردن و ڕۆژی دوایی کار دەکات و لە چاکەدا دەژی هەروەها بە واتای پاداشتیش هاتووە ، هەروەك دەوترێت : ( دانە : یدینە : دیناً ) واتا پاداشتی دایەوە، هەروەها دەوترێ : کما تدینً تدان، واتا چۆن بکەیت ئاوەها پاداشت دەکرێی [2]

لە (( معجم الوسیط )) یش ( دان – دیناً ) بە واتای : ملکەچی کرد و گوێڕایەڵی کرد هاتووە،(( الدیانە )) ە ش بە واتای : ئەو شتەی مرۆڤ دەیکاتە ئاینی خۆی و ئایینداری پێ دەکات [3].

---

[1] الفیروز ابادي ، مجدالدین محمد بن یعقوب : القاموس المحیط ، ج ٦ ، ل ١١٩٨

[2] الرازي ، محمد بن ابي بکر عبدالقادر : مختار الصحاح ، ل ٢١٨

[3] معجم الوسیط ، مجمع اللغة العربیة ، ل ٣٠٨ .

### ئاین لە رووی زاراوەوە

باسی ئاینمان کرد لە رووی زمانیەوە و لەوەشدا وشەی ( دین ) ی عەرەبیمان شی کردەوە، ئێستاش دێینە سەر باسکردنی رووی زاراوەیی وشەکە تاوەکو بگەینە خاڵە لێك نزیکەکانی جۆری زمان و زاراوەییەکەی ئەم وشەیە .

( دین ) یان ( دیانە ) ناوێکی کۆی گشت ئەو شتانەیە کە خوای پێ دەپەرسترێت، میللەیە ( چەند نەتەوەیە کە ئاین پێکەوە کۆیان دەکاتەوە ) ئیسلامە ، باوەڕی دڵ و دەرخستنی باوەڕی دڵە لەسەر زمان و کارپێکردنێتی، رێبازی ژیانە، نەریت و حاڵ و بار و دەسەڵات و قەزاوەت و کار رێکخستنە

بە رامان لە قورئانی پیرۆز و تێگەشتن لە وشەی ( دین ) لەو ئایەتانەی ئەو وشەیان لە میانەدا هاتووە، دوو واتا هەڵدەگرێ کە هەر دوو واتاکە ئەلقەیەکی گرێدراون کە ئەمانەن :

١- رێبازێکە لە ژیاندا پەیرەو بکرێ :

مرۆڤ کە دێتە سەر زەوی بەدەر لە خۆرسکەکەی، لە دەوروبەریدا جۆرە بیرکردنەوەیەك دەبیستێ کە لە دەرەوەی سروشتەوەیە و پەیوەستە بە جۆری بیرکردنەوەی خەڵك و کۆمەڵگەکەی سەبارەت بە خوا و شتە پەنهانەکان و پاشان جۆری ئەو یاسا و رێسایانەی کە کۆمەڵگە و تاکەکان بە نەریتیان کردووە .

خوای گەورە دەفەرموێت : إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ [٤].

واتا : فرمان و دەسەڵات تەنیا هەر بۆ خوایە و فرمانی کردووە کە هەر ئەو بپەرسترێ ، ئەم ئاینە راست و تەواو تۆکمەیە ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن و ئاینی راست و راستەقینەیی ناناسن .

---

[٤] سورة یوسف ، ئایەتی : ٤٠

لەو ئایەتەدا دەردەکەوێت کە ڕێباز و دەستوری دەسەڵاتدارێتی قبوڵ کراو تەنیا بۆ خوایە کە لەلایەن خۆشیەوە بۆ مرۆڤایەتی دابەزێنراوەتە سەر زەوی ، وشەی ( القیم ) یش بە وەسفێك دراوەتە پاڵ ( الدین )،

ئـەوەش جیـا کردنـەوەی هـەموو ئـاینێکی شـێوێنراوەیە کـە پێشتر ڕاستەقینەییەکی ئاسمـانی بـووە و جیاکردنـەوەیان لـەو ئاینـەی ( قیم ) و تەوحیدیە، پەروەردگار دەفەرمووێت : هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ [1] بۆیـە لـەم ئایەتـەدا دەردەکەوێ کە هەر ڕێبازێك مرۆڤ دایهێنابێ، مارکسی بێ یان بونگەری ( وجودی ) و ...... هتد ئەوا بە ئاین دەناسرێ گەرچی ئاسمانیش نەبن، چونکە کراونەتە ڕێبازی ژیان و بواری بیرکردنەوەیان داگیر کردووە و کۆڕ و کۆبوونـەوە و شـوێنکەوتەیان لـە ئـاینی قبـوڵکراوی خـوایی داڕنیـوە و جیاکردوتەوە و چارەسەر لە جگە لەو پەیامە دۆزراوەتەوە .

هەر پەروەردگار خۆی دەفەرموێ : وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ [2]

واتا : هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بە ئاین بکات،ئەوا لێ ی قبوڵ ناکەین و لە دوا ڕۆژیشدا لە خەسارەتمەندانە و لە ڕیزی دۆڕاوەکاندایە .

٢ – واتای ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە :

لە پاڵ گەیاندنی واتای ڕێباز، واتای ڕۆژی دوایش دەگەیەنێ، وەکو دەبینین لەو کاتەی شەیتان ململانێی لەگەڵ ڕێبـازی خـوادا هێنایە ئارایەوە

---

[1] سورة التوبة ، ئایەتی ٣٣

[2] سورة ( ال عمران ) ، ئایەتی: ٨٥

خوای گەورە فەرمووی : وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَى يَوْمِ الدِّينِ [3] ، واتا تۆ ئەی شەیتان تاوەکو ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە لە سۆز و بەزەیی من بە دووری .
بە هەمان واتاش فەرمووی : وَإِنَّ عَلَيْكَ اللَّعْنَةَ إِلَى يَوْمِ الدِّينِ: [4] ، وە هەروەها فەرمووی : مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ [5] بە تێڕامان لە وشەی ( دین ) لەو سێ ئایەتەدا ئەوە دەگەیەنن بەوەی وشەی ( دین ) ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەش لە خۆ دەگرێ، واتا کۆتا ئەڵقەی پاداشت کردنەوەی مرۆڤەکانە لەسەر ئەو ئاینەی لە ژیانی دونیایاندا بە ڕێبازی خۆیانیان کردووە .
ئیمام ( أبو الأعلى المودودي ) یش بە ڕەحمەت بێ باسی لە وشەی ( دین ) ی کردووە بەوەی چوار بەش لە خۆدەگرێ:

١- حاکمیەت و دەسەلأتی بالأ
٢- گوێڕایەڵی کردنی ئەو حاکمیەت و دەسەلأتە .
٣- سیستەمی فیکری و کرداری پێکهاتووی ژێر دەسەلأتی سوڵتانی ئەو حاکمیەتە
٤- ئەو پاداشتەی کە دەسەلأتی بالأ دەیبەخشێتە شوێنکەوتووانی ئەو سیستەمە لە دڵسۆز بۆ بوونی یان هەڵگەڕانەوە لە دژی و گوێڕایەڵی نەکردنی [6]

ئەو پێناسەیەی کە ئیمام باسی کردووە لە قورئانی پیرۆزدا واتای دۆزیوەتەوە کە ئاینێکە باس لە کاروبارەکانی دونیا و دوا ڕۆژ دەکات، ئیسلام ئاینێکە کە هەموو کاروبارەکانی ژیانی کۆ کردووەتەوە : کۆمەلأیەتی ، پەروەردەیی ، دەروونی و ئابوری و سیاسی و تەشریعی تەواو و دسەلأت و سیستەمەکەی دەوڵەت و دەسەلأتدارەکانی و تەواوی بەرپرسیاریەتەکانی تاك و خێزان و کۆمەڵگە و ئوممەتی لەخۆ گرتووە [7]

---

[3] سورة ( ص ) ، ئایەتی: ٧٨
[4] سورة الحجر ، ئایەتی: ٣٥
[5] سورة الفاتحة ، ئایەتی: ٤
[6] ابو الأعلى المودودي : المصطلحات الأربعة في القران ، لا ١٠٩
[7] د . عدنان رضا الخوري : مفهوم الدين بين الحقيقة والتحريف . لە ئینتەرنێتەوە .

دەکرێ ئەوەش بوترێت کە پێناسەی ( دین ) بەپێ ی ئەوەی لە ئینجیلدا هاتووە تەنیا واتای پاداشت لە خۆ دەگرێ، پاداشتی باش یان خراپ ( کە سزایە ) و لێپرسینەوەیە، لە ( مەتا ) دا هاتووە کە عیسای مەسیح ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) لەوەی لەسەر ئیدانە کردنی کەسانی تردا لەلێ : (( پاداشتی خراپ ئیدانە مەکەن ، تاوەکو ئێوەش پاداشتی خراپ نەکرێن، چونکە ئێوە بەو لێپرسینەوە و سزایەی ئیدانەی پێ دەکەن لێپرسینەوە دەکرێن ، بەو کێش و ترازووەش کە پێوانەی پێ دەکەن بۆ ئێوەی لێ پێوان دەکرێ )) [٨]

بۆیە لەو هەموو واتایانەی ( دین ) دا ئیسلام هەمووی لەخۆدەگرێ،رێبازێکی تەواوە و ژیانی دونیا و دوا رۆژ لەخۆدەگرێ . [١]

پەروەردگار دەفەرموێ : الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا [٢]

گەرچی هەندێ کەسی روناکبیر وەها پێناسەی ئاینیان کردووە کە شعورێکە و لە ناخی مرۆڤدایە و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خواوەندەکەیەتی، بەلام ئەوەی ئێمە لەبارەیەوە دەنووسین باسی ئەو سێ ئاینەیە کە خوای گەورە بە پەیام بۆ پەیامبەرەکانی ناردوویەتی، بە مەبەستی رێنیشاندەری مرۆڤەکان و بەستنەوەی نێوان کردار و بەرنامەکانی ژیانی سەر زەوی و ئەو ژیانەی دوای مردن کە هەڵسەنگاندن و پاداشت کردنە .

---

[٨] ئینجیلی { متی ٧:١ }

[١] د . عدنان رضا الخوري : مفهوم الدين بين الحقيقة و التحريف . لە ئینتەرنێتەوە .

[٢] سورەتی مائیدة : ئایەتی ٣

## بەشی دووەم

## ململانێ و حیکمەتی خوایی

تاقیکردنــەوەی مرۆڤــەکان ســوننەتێکی خوایییــە و خــوای گــەورە کردوویەتیە پێوەری کردارەکانی مرۆڤ، ئەو تاقیکردنەوەشە کە هێز و ویستی گەیاندۆتە ململانێی و دوو بەرەی پێکهێناوە. ئەو تاقیکردنەوانەی تایبەت بە مـرۆڤن ، ئـەنجامی وەدەسـت خـستنی گەورەییـەك بـووە بـە ئـادەم، بـاوكی مرۆڤایەتی بەخشراوە، لێرەوە ململانێ دەست پێ دەکات. ئیبلیس خۆشی بە ئادەمدا نایەت، ئادەم لە روانگەی ئیبلیسەوە كێبركێكاری نوێیە کە پێشتر وەهای بۆ روونەداوە، دوای ئەوەش کە فرمانی کڕنۆش بردنی بۆ ئادەم پـێ دەدرێت، رق و دوژمنایەتیەکەی بۆ ئادەم لە دڵ و پچە کردنەوە دەگوازێتـەوە بـۆ ئاشـکرایی و سـەختگیرانە دوژمنایـەتی دەکـات، خـوای گـەورە پێـی دەفەرمووێ: (( قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ )) [1]

واتـا :واتـە ئـەی ئیبلـیس چ شتێك رێگریـت دەکـات لـەوەی کڕنۆش ببەی لـە کاتێکـدا کـە فرمـانم پـێ کـردووی، وەڵامـی ئیبلیـسیش راگەیانـدنێکی دوژمنکارانە بوو بەوەی من لەو باشترم، تـۆ منت لـە ئـاگر دروسـت کـردووە و ئادەمیش لە گڵ .

لێرەوە ئیبلیس ( شەیتان ) دەکەوێتە بەر تانە و نەفرەتی خوایی و بۆ تۆڵە کردنەوەش دەکەوێتە پلان داڕشتن و سوود وەرگرتن لە خاڵە لاوازەکان .

راستەقینەیی و پێچەوانەکەی، مـاف و ستەم لـەم میحـوەرەوە هاتۆتـە ژیــانی مرۆڤــەوە، تــاوەکو ئــەو دیــاردە و حاڵەتانــەش هــەبن، ئــەوا بــۆ جیاکردنــەوەی ئــەو دژانــە و دەرکــەوتنیان، کــە کۆتــایی هەوڵــە ململانــێ پێویستە.

---

[1] سورەتی : الاعراف ، ئایەتی ١٢

ململانێی باش و خراپ هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە، تەنانەت دار و بەردەکانیش. سوودی بەشێکی ئەو ململانێیەش دەرکەوتنی ژیان و پابەندبوونی زۆرێك مرۆڤە بەو داد و راستیەی کە کردەی پێچەوانە جوانیانی دەرخستووە، وەکو ئەوەی لوقمانی حەکیم دەڵێ : رەوشت ناشیرینی کەسانێ رەوشت جوانی لا شیرین کردووم، پوختەی مەبەستیش ئەوەیە ل کردەی ناشیرینی کەسانی دیکە وانەی وەرگرتووە

گرنگترین قۆناغەکانی ململانێ لە مێژوودا ململانێی کوفر و باوەڕداریە، ململانێیەکی کۆنی مرۆڤایەتیە، ململانێیەکی درێژیشە بە درێژایی تەمەنی ژیانی تاك و کاتی ئەم زەویەی کەسی لەسەر نامێنێتەوە، ململانێیەکی تاڵیشە، چونکە ململانێی دژەکانە .

خوای گەورە وێنەی ئەو ململانێیەمان بۆ دەکات (( قَالَ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ))[٢]

واتا: لەوەی منت نەفرەتدا، بۆیان دادەنیشم و لە بۆسەدا دەبم بۆیان تاوەکو لە رێگە راستەکەی تۆ لایاندەبەم .

بۆیە ئەو هەموو جەنگ و پەشێوی و رواڵەتی کاولکاری و برسی کردنەی کە دەبینرێت، ئەنجامی ململانێی مرۆڤایەتیە و سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جەنگە شاراوەکەی نێوان شەیتان و ئادەمی باوکی مرۆڤایەتی

کەمێ لە مرۆڤەکان لایەنی چاکە و خووە جوانەکان وەردەگرن، کەمیان شوێن پێی پێغەمبەران هەڵدەگرن و لەو ململانێیەدا بەرەی چاکەخوازی هەڵدەبژێرن، کە بۆ شەیتان سەختە بەسەر ئەو بەرەیەوە دەسەڵات بکات .

---

[٢] هەمان سەرچاوە ، ئایەتی ١٣.

ململانــێ سـوننەتێکی حەتمیـە و پەیوەسـتە بـە سروشـتی دروسـت بـوونی مرۆڤـەوە، بـە تایبـەت لـە بەرامبـەر باوەڕدارانـدا و هـەموو ئەوانـەش تاقیکردنەوەیە، پەروەردگار دەفەرموێت : (( الم ، أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ، وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ )) [٣]

واتــا: ئــاخۆ ئــەو خەڵکــەی باوەڕیــان هێنــاوە وەهــا گومــان دەبــەن لــە باوەڕداریەکــەیان تــاقی ناکرێنــەوە، بێگومــان کەســانی پــێش ئێوەشمــان تاقیکردووەتـەوە ، ئێـوەش تـاقی دەکەینـەوە تـا راسـت بێـژان و درۆزنـان لـەو تاقیکردنەوەدا دەرکەون . دیارە تاقیکردنەوەکانیش ناڕەحەتی دروستکردنی سـتەمکار و بـێ بڕواکانــە و ئــەو ئایەتانــەش هانــدەری موســڵمانانە بــۆ دامەزراوبوون و دەست هەڵنەگرتن لە ئاین .

ململانێ لێرەدا تاقیکاری و تاقیکردنەوەیە، ئەو تاقیکاریەش تەنیا لە رێگەی ئەو ململانێ یە و لێ دەرچوونە بۆ کۆتایی

ململانــێ ی نێــوان ئــەم ســێ ئاینــەش کــە پێغەمبــەرەکانیان خــوا ناردوونی لـە قورئانـدا ئاماژەی بۆ کراوە کـە دەفەرمووێت : (( وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ )) [١]

واتا : هیچ کات و بۆ هەمیشە جولەکە و گاورەکان لێت رازی نابن، تاوەکو نەبیتە شوێنکەوتەیان و چاو لە میللەتی ئەوان نەکەی .

ئەمە پەیامی خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی و ئاشنا کردنی موسڵمانانیشە بە سروشتی مامەڵەیان و وریایدەرە بۆیان بەوەی ئەو ململانێیەی کەوتۆتە نێوانیانەوە بێ کۆتاییە، تا ئەو کات بڕیاری ملکەچ بۆکردنیان دەدرێت !

ئەم وریایدانەش واقیعیانە دەبینین، تەسکینیان نایەت بەوەی هەموو رێگەیەك بگرنە بەر لە قەلاچۆکردنی موسڵمانان و برسی و نابوتکردنیان . .

(( وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ )) [٢]

---

[٣] سورەتی : العنكبوت ، ئایەتی ( ١- ٣ )

[١] سورەتی : البقرە ، ئایەتی ١٢٠

[٢] سورەتی : هود ، ئایەتی ١١٨

واتا : ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ هەبووایە ئەوا خەڵکی دەکردە یەک ئوممەت و کۆی دەکردنەوە، بەڵام نەیانی کردە یەک ئوممەت و لە جیاوازیدان بەو ململانێیە باش و خراپە و راستی و پوچوڵی لێک جیا دەبنەوە، بە درێژایی مێژووش رەوتی ململانێکار و رێباز و بیرگەلێکی جیاواز دەرکەوتوون، بە ئێستاشەوە، بیرێك لەتەك بیرێکی دیکەدا جیاوازی هەیە و ئەو جیاوازیە ململانێ دروست دەکات، کەم بیر و رێباز هەیە لە ململانێکانیدا نرخێك بۆ بەهای مرۆڤایەتی دابنێ، چونکە خوێندنەوەیان بۆ ئاراستەی ململانێکانیان زۆر دڕندانەیە، بە ئاژەڵکردن و بنەبڕکردنی هەموو بەهاکان لە مرۆڤ و پیرۆزی بە پێویست دەزانن بۆ گەیشتنە ئەو سەردەمەی هەیکەلی سولەیمان دروست دەکرێتەوە، لەوەش بە دوا ململانێکان بەردەوام دەبن، نەك لەوەی جارێکی دیکە لایەنی سەرکەوتوویی ململانێکە ئوممەمیەکان بن، نەخێر، بەڵکو ململانێکە زیاتر بەرەو چەوساندنەوەی غەیر جولەکە ( ئوممەمیەکان ) دەچێ .

ئەوەبووە بانگەوازی پێغەمبەران ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) .

موسا لە گەیاندنی ئەو بانگەوازەدا دەیان سەغڵەتی و نالەباری بۆ دروستکراو بە خەفەتی ئەوانەوە کۆچی کرد،عیساش (سەلامی خوای لەسەر بێ) لە بوونیدا لەسەر زەوی بە دەست کاهینەکانەوە لە رێگریکردن لە خراپە و فرمان بە چاکە کردن بوویە هۆی پلان داڕشتن بۆ لە خاچدانی کە خوای گەورە لەوەدا رزگاری کرد .

ئەو ململانێیەش کە موسڵمانان پێیدا تێپەڕ دەبن، هەمان ململانێیە کە پێغەمبەران و خوا ویستان پێیدا تێپەڕیوون ، بەڵام ئەوان دامەزراو بوونە و بە چاو و دڵ حیکمەتی ئەو ململانێیانەیان دەرك کردووە و زانیویانە ئەو دامەزراویەیە بووەتە نرخی گەیشتنە چێژی باوەڕ و دڵنیایی، ئەوەش تاج و بەخششی خواییە بۆ ئەوانەی ئاشتی و کەرامەت و نرخی مرۆڤەکانیان لا گرنگە .

# بەشی سێیەم

## ئاینی یەهودییەت

### باسی یەکەم
### نەوەی ئیسرائیل و مێژوویەکی کورتی

### باسی دووەم
### یەهودییەت و دروستبوونی

## باسی یەکەم
## نەوەی ئیسرائیل و مێژوویەکی کورتی

سەرەتا پێش ئەوەی بچینە سەر باسی نەوەی ئیسرائیل ( بنی اسرائیل )، دەبێ بڕوانینە بنەچەی ئەم نەوەیە و ڕەچەڵەکی ئەم نەوەیە بزانین،دیارە ئیبراهیم ( علیە السلام ) خاوەن دوو کوڕ دەبێ بە ناوەکانی ئیسماعیل ( علیە السلام ) و سەرەنجام ئەم کوڕەی لە مەککەدا لەتەک هاجەری دایکیدا دەگیرسێتەوە و لەوێدا دەبێتە پێغەمبەرێکی خوا و بانگەوازی یەکتاپەرستی لە نێو ئەو خێوەت نشیانەدا بڵاو دەکاتەوە کە لە دەوروبەری ئەواندا نیشتەجێ دەبن، کوڕی دووەمی ئیبراهیم ( علیە السلام ) ئیسحاق دەبێ ( علیە السلام )، ئیسحاق دوو کوڕی دەبێ بە ناوەکانی عیصۆ و یەعقوب، بەپێی باسە دروستکراوەکانی عەهدی قەدیم چیرۆکێکی سەیر لە نێوان ئەو دوو برایەدا گێڕدراوەتەوە و ئێستاش لە شێوەی فیلم لە نێو خەڵکیدایە و خراوەتە سەر سیدی و بە ئینگلیزی و ژێر نوسراوی عەرەبی لە بازارەکاندا دەفرۆشرێت .

باس دەکرێت کە عیصۆ لەلای ئیسحاقی باوکی زۆر خۆشەویست بووە و زیاتر گرنگی بە عیصۆ داوە و ویستی پێغەمبەرایەتی دوای خۆی بۆ ئەو بووە، یەعقوبیش خۆشەویستی دایکی بووە و وەکو عیصۆ گرنگی پێدراو نەبووە لەلایەن باوکیەوە

باوکی دەکەوێتە سەرەمەرگوداوا دەکات عیصۆ لە نێچیرێکی کێوی خواردنێکی بۆ ئامادە بکات تاوەکو پلەی پێغەمبەرایەتی دوای خۆی پێ ببەخشێ، دایکی لە پشت خێوەتەکەوە ئاگای لەوەها باسێکی گرنگ دەبێ و دەبینێ عیصۆ بۆ ڕاو دەردەچێ، بۆیە خێرا خۆی دەگەیەنێتە یەعقوب و ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەو حەز دەکات و تامەزرۆیە ئەو پێغەمبەرایەتیە بۆ ئەو بێ، ئاژەڵێکی بۆ سەر دەبڕێ،

ئیسحاق نابینا دەبێ بۆیە تاوەکو وەها دەربخات کە یەعقوب عیصۆیە، بە پێستێکی خورین دەستی یەعقوب دەبەستێ و دەڵێ ئێستا خواردنەکە بۆ باوکت ببە و بڵێ زوو راوم کرد، یەعقوب دەچێتە لای ئیسحاقی باوکی و خواردنەکەی دەداتە دەست، ئیسحاق دەست لە باڵی دەدات و تووکی دەستی بەردەکەوێ و نازانێ ئەوە تووکی دەستی نیە بەڵکو مووی ئاژەڵە، ئەو موو لە دەست کردنە بۆ ئەوەیە دەربخرێ کە عیصۆیە، چونکە یەعقوب بێ موو بووە ( بە پێی ئەو باسە ) ئینجا ئیسحاق خواردنەکە دەخوات و بۆ وەرگرتنی پلەی پێغەمبەرایەتی دوعای بۆ دەکات، واتا یەعقوب لە جیاتی عیصۆ دەبێتە خاوەن پلەی پێغەمبەرایەتی دوای باوکی، کە عیصۆ دەگەڕێتەوە و خۆی و ئیسحاقی باوکی لە وەها باسێك حاڵی دەبن زۆر بێزار دەبن، لەوەدا دایکی یەعقوب، ئامۆژگاری یەعقوب دەکات کە زەوی کەنعان بەجێ بهێڵێ تاوەکو لە رقی عیصۆی برای پارێزراو بێ، یەعقوب روو دەکاتە ماڵی خاڵۆی، خاڵۆی دوو کچی دەبێت، جولەکە لە ناشیرینکردنی پێغەمبەرانیش بێ دەربەستن، بۆیە دەڵێن هەر بەگەیشتنی یەعقوب و بینینی کچی بچووك، نیگا گۆڕینەوە دروست دەبێت،خاڵۆی بەڵێنی پێدانی کچی دووەمی پێ دەدات بەرامبەر شوانێتی بۆ کردنی، شەوی گواستنەوە دەیێت عەرەقێکی زۆر بە یەعقوب دەدرێ ( پەنا بە خوا لە وەها باسێك ئەوەی ئێمە دەمانەوێ باسی بکەین تەنیا پوچوڵی ئەو چیرۆکەیە ) کە دەچێتە ژووری بووك سەرخۆشە، بەیانی هەڵدەستێ دەبینێ کچی یەکەمە نەوەك کچی دووەم، عەرەقیشی پێدراوە بۆ بێ هۆشکردنی بووە و لەو شەوەدا کچی بچووك بەستراو بووە و رێگری کراوە لەلایەن باوکیەوە، یەعقوب لەوەدا بێ قەرار دەبێ، باوکی کچەش رەزامەند دەبێ کە کچی بچووکیشی پێ بدات بەرامبەر درێژکردنەوەی شوانێتی کردنەکەی .

له قورئاندا خوای گەورە باس دەکات کە پێغەمبەران هەڵبژێردراوێکی پاکی نێو مرۆڤەکانن و بە پاکی و خوڕەوشتی جوانیان شایەنی ئەو پلەیەن، گەیشتنە ئەو پلەیە بە ئامرازی فێڵاوی ناکرێت، خوای گەورە یەعقوبی بە ئیسرائیل ناوبردووە، کە کوڕی دووەمی ئیسحاقە ( علیه السلام ) و لە خاکی کەنعان ( فەلەستین ) ژیاوە ،ئیسرائیل وشەیەکی لێکدراوە و پێکهاتووی ( ئیسر ) واتا بەندە ( عبد ) یان هەڵبژاردە ( ئیل ) یش بە واتای ( الله )، ئەم ناوە لێکدراوەش بەندەی خوا ( عبدالله ) یان هەڵبژاردەی خوا ( صفوة الله ) دەگەیەنێ، ئەوەش وەسفی قورئانیە بۆ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خۆی کە یەعقوبە ( علیه السلام )، هەڵبژاردەیەك بووە لە هەڵبژاردەکانی خوا لە پاکی و گەورەیی و ڕێز و جوانی، دەنا مرۆڤی فێلباز و فێڵاوی و بێ هۆش و ڕێگری کانی ژنان ! نابنە هەڵبژاردەی نێو پێغەمبەران

بەنی ئیسرائیلیش بە دوانزە کوڕەکەی یەعقوب دەوترێ، خوای گەورە لەدوای بێ سەر و شوێنکردنی یوسفی کوڕی یەعقوب لەلایەن براکانیەوە، لە میسردا یوسفی کردە دەسەلاتدار و براکانی و باوکی دوای دابڕانێکی چەندان ساڵ لە هەواڵی یوسف ئاگادار بوون، پێکەوە زەوی کەنعانیان بەجێ هێشت بەرەو میسر .

یوسف ( علیه السلام ) بەکارە جوانەکانی و ئەو دادگەرە کۆمەڵایەتیەی کە لە زەوی میسردا بە ئەنجامی گەیاند ڕێز و خۆشەویستی و ملکەچیەکی زۆری لەلایەن خەڵکی میسرەوە بۆ دەستەبەر بوو، پاش ماوە ئەو دوانزە برایە وەچەیان زۆر بوویەوە؛ ئەو نەوەیە سودێکی زۆریان لە خۆشەویستی خەڵکی میسر بۆ یوسف بینی و ئەو خۆشەویستیەیان بۆ خۆنواندن و خۆبە گەورە گرتن بەکار برد،

وەکو ابو الأعلى المودودي ئەڵێ [1]: بۆ ماوەی سێ سەد ساڵ یان چوار سەد ساڵ دەسەڵاتی میسریان بە دەستەوە بوو، خۆ گەورە نواندنیان هەستی نیشتمانی و دەمارگیری لای خەڵکە کۆنەکەی میسر دروست کرد و خۆ بە گەورە نواندیان بە ملکەچی گۆڕییەوە وکاردانەوەی میسریەکان گەیشت بەوەی هەموو شوێنەوارێکی یوسف لە میسردا نەهێڵن و بیگەڕێننەوە سەر ئاینی نەفامی

تاوەکو سەردەمی موسا (علیه السلام ) دێت ( باسی موسا (علیه السلام) بۆ بایەتی یەهودیەت بەجێ دەهێڵین ) نەوەی ئیسرائیل دوای سەدان ساڵی ژێر دەستەیی دەگەڕێنەوە خاکی کەنعانیەکان و لەوێدا رێژەیان زیاتر دەبێ، لە دەسەڵاتی سەر زەمینی میسر ئەزموون وەردەگرن، دسەڵاتی سێ پادشای بەنی ئیسرائیل دەبینین کە طالوت ( شاؤول ) و داود و سولەیمان ( سەلامی خوایان لێ بێ )، لە ساڵی ١٠٢٥ یەهودیەت دروست دەبێ، یەکەم پادشای ( طالوت ) دەبێ کە بە هۆی ئاسنگەریەکەیەوە لێی رازی نابن، سەردەمی طالوت وداود و سولەیمانی پێغەمبەر بە سەردەمی پادشای یەکەم ناسراوە، نەمانی ئەو سەردەمەش بە مردنی سولەیمانی پێغەمبەر کۆتایی دێت [2]

ئەو پادشایەتیە دوای مردنی سولەیمان دەبێتە دوو پادشانشین و دابەشبوونی بەسەر دێت، پاشانشینی یەهوزا و پایتەختەکەی ئۆرشەلیم دەبێ و دەبێتە بەشی نەوەکانی یەهوزا و بنیامین، پادشانشینی ئیسرائیل و پایتەختەکەی سامیرە دەبێ و دەبێتە بەشی نەوەی دە براکەی تر [3]

---

[1] ابو الأعلى المودودي : المصطلحات الأربعة في القران ، لا ٥٩

[2] ماهر احمد اغا : اليهود فتنه التاريخ ، لا ٢٧ ، ٥٩ .

[3] هۆکارەکانی ناونانی بەنو ئیسرائیل بە یەهود ، و – عبدالله گەرمیانی ، رۆژنامەی : رێگەی یەکبوون ، ژ/ ٨٦ ، ٢٠٠١/٤/١٦ ز .

( ابن خلدون ) یش دەڵێ: ماوەی مانەوەی یەعقوب (علیه السلام) و کوڕەکانی لە میسر تا دەرچوونی بەنی ئیسرائیل لەو وڵاتە، دوو سەد و بیست ساڵ بووە [٤]

لە وەتەی ئەو دوو دەوڵەتە دابەش بوو، پەیوەندیەکانیشیان نالەبار و پەشێو بووە، دەست وەردانە کاروباری شەریعەت و دەست کاری کردنی دەقەکان کار لە سەر کراو بوو، بۆیە زۆربەی یاساکانی تەورات و ئامۆژگاری پێغەمبەران لەلایەن گەورەکانەوە بەرژەوەندیانە نووسرابوونەوە، چونکە موسا ( د . خ ) بە مەردێکی کاریگەر و خاوەن دەسەڵات ناو دەبرێت، بەڵام زۆربەی لاهوتزانی دیان باوەڕیان وایە کە موسا یەکە دانەری ئەم سیپارەیە نەبێت، بەڵکو بە دەستی چەندین دانەران نوسرا بێتەوە، لەراستیشدا لە پاش کۆچی دوایی موسا نوسرایەوە [٥] ، بۆیە زۆرێك هەنگاویان بەرژەوەندیانە بووە، جەنگ و دوژمنکاری و ململانێیان بەردەوام بووە، تا گەیشتووە بەوەی پشتگیری و هاوکاری لە شوێنانی دیکە پەیدا بکەن دژ بە یەکتر، لە لاوازی و ڕۆچوونیان لە ئامرازەکانی خراپەکاری، نەبوخوزنەسر توانی پادشانشینی یەهوزا و ئیسرائیل لە نێو بەرێ، تەلمود [١] لە بارەی ئەو ڕوخانەوە ئەم قسەیە دەگێڕێتەوە کە ئەرمیای پێغەمبەر بە نەبوخوزنەسر ( بختنصر ) و کلدانیەکان ئەڵێ:

(( وەها گومان نەکەی کە تۆ تەنیا بە هێز و بازووت بەسەر گەلی هەڵبژێردراوی خوا زاڵبوویی، بەڵکو هۆکاری دەرونە تاوانکارەکانیان بوو بەم سزایەیانی گەیاند )) [٢]

---

[٤] ابن خلدون : مقدمة ، لاپەڕە ٩ ، بێیروت – لبنان ، دارالکتب العلمیة .

[٥] د . مایل هارت : ١٠٠ ناودار ، و:ئەسعەد قەرەداغی،لا ٧٨

[١] جولەکەکان لەبارەی تەلمودەوە ئەڵێن : خوای گەورە لە پاڵ ئەوەی تەوراتی بۆ موسا دابەزاندووە ، تەلمودیشی بە زارەکی بۆ ناردووە تاوەکو گەر ڕۆژێك هەر نەتەوەیەك بەسەر جولەکەدا زاڵ بوو ، ئەوا تەلمود ببێتە نیشانەیەکی جیاکەرەوە لە نێوان جولەکە و نەتەوەکانی تر .

[٢] ماهر احمد ئاغا ، الیهود فتنه التاریخ ، لا ٧٢ .

پێش هێرشی بەختەنەسر ، ساڵ ٧٢١ پ . ز ئاشوریەکانیش خاکیان داگیرکرد بوو کشایە سەر پادشانشینی یەهوزا و گرتی و لە گرتنیدا بەردەوام بوو تا گرتنی پادشانشینی ئیسرائیل لە باکور کە پێشتر ئاشوریەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، بۆیە پادشانشینی بابلی ( بەختەنەسر ) کە دەسەڵاتی ئاشوریەکانی بۆ بوو، هێرشی کردە سەر فەلەستین و تێکشکا و هەردوو پادشانشینەکەی لێ وەرگرتەوە و ساڵی ٥٨٧ پ . ز مزگەوتی ئەقصای روخاند و زۆرینەی نەوەی ئیسرائیلی کردە سەبایە و ئەو ماوەیەش بە کۆیلایەتی بابل ناسراوە .

خوای گەورە لە قورئاندا زۆرێك باس لە بەنی ئیسرائڵ دەکات و هەر لە بارەی ئەو کاولکاریەی بەسەر جولەکەدا هاتووە دەفەرموێت :

(( وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ، فَإِذَا جَاء وَعْدُ أُولاهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَا أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلاَلَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولاً )) [٣]

واتا : لە ( لوح المحفوظ ) لەسەر بەنو ئیسرائیلمان نوسیوە کە دوو جار خراپەکاری لەسەر زەویدا دەنێنەوە و زۆر لە خۆبایی دەبن وبەسەر خەڵکیدا دەنازن ( زەکەریا و یەحیا شەهید دەکەن ) ئەگەر جاری یەکەم هات، ئەوا بەندەی خۆمانیان بۆ دەنێرین کە خاوەن هێز و بازوویەکی سەختە و بە هەموو شوێنێکدا بە دواتاندا دەگەڕێن، ئەوەش وەعدێکە کە هاتووەتە دی و هاتنەدی دڵنیاییە .

( عباداً لنا ) ئاماژەیە بۆ نەبوخوزنەسر و سوپا دڵڕەق و بێ بەزەییەکەی بەرامبەر بەنی ئیسرائیل، هۆکاری ئەو تێکشکان و نەهامەتیەشیان ئەو ستەم و دوژمنکاری و فەسادەیە کە گیرۆدەی بوون [٤]

---

[٣] سورەتی : الاسراء ، ئایەتی ٤ و ٥ .

[٤] للحمصي : مفردات ، تفسير و بيان اسباب النزل للسيوطي .

لە پاڵ ئەو خراپەکاریانەدا تاوانی گەورەیان ئەنجام دەدا و پەیڕەوی شەریعەتی خوایان نەدەکرد، هەروەکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:( لا ترتکبوا ما ارتکب الیهود فتستحلوا محارم الله بأدنی الحیل )

واتا : ئێوە ئەی موسڵمانان وەکو جولەکە لە هەوڵی تاوانکاریدا مەبن و نەکەن بە فڕوفێڵ حەرامەکان حەڵاڵ بکەن و سنوری خوا ببەزێنن .

ئەو فروفێڵانەیان لە سادەترین کاردا ئەنجام دەدا، کە گەیشتنە شتێك بوو لە رووی شەرع و نەریتی ساغەوە قەدەغە بوو .

ئەو دوو دەوڵەتەش کە رووخان، ئاینیانە بوونیان هەبوو، پێغەمبەران سەرۆکایەتیان دەکرد و لە پێشتردا یەك بوون، لە رێگەی پێغەمبەرانەوە کە بانگەوازی مرۆڤایەتیان دەکرد بۆ چاکسازی و برایەتی فراوان بوونەوە، بانگەوازیان بۆ یەکتاپەرستی بوو نەك نەتەوایەتی . هەروەکو ئەنجومەنی یەهودیەتی ئەمریکی لە کتێبێکدا (( یەهودیەت ئاینە نەك نەتەوە )) زۆر بە جوانی وەسفی هاتووە[٥]

پەرتووکەکەیان کە ( تەورات ) ە و پێشتر لە لایەن خوای گەورەوە بۆ موسا دابەزێنراوە ، دوای نەمانی موسا بە چەندین ساڵ نوسراوەتەوە و گۆڕدراوە ، تیایدا ناوبانگی پوختی پێغەمبەرانیان لەکەدار کرد ، وەهایان نووسیوە کە دوو کچەکەی لوت ( علیه السلام ) بۆ ئەوەی سەر زەوی مرۆڤ بە خۆیەوە ببینێ عەرەقیان بە باوکیان داوە و لە گەڵیدا جووت بوونە و هەموو مرۆڤەکان لەو دوو جووت بوونەیە

داودیان بە داوێن پیسی ناوزەد کرد، سولەیمانیش بە بت پەرست ( حاشا ) گەر پێغەمبەران و هەڵبژێردراوانی خوا وەها رەوشتێکیان لێ بووەشێتەوە، ئەوان پەرتووکەکەیان کردە جێی مەرامی تەماحیان و پڕیان کرد لە فەرمان کردن بە کوشتن و داوێن پیسی و بەرتیل خۆری و خراپەکاری.

درێژەدان بەم باسە رەوشتیە پشت بە خوا بۆ ململانێی ئەخلاقی جێ دەهێڵین .

---

[٥] مصباح المحجوب : بیت العنکبوت ، لا ١١

باسی دووەم :

یەهودییەت و دروستبوونی

له باسی پێشوترداباسی بەنی ئیسرائیلمان کردبەهاتنی یەعقوب ( یەعقوب ) لەو ولاتەدا بلاوبوونەوە، قۆستنەوەی خۆشەویستی خەڵکە رەسەنەکەی میسر بۆ یوسف بۆ وەکاربردن ( استغلال )، وەهای کرد رقێکی سەخت لەلایەن خەڵکی میسرەوە بەرامبەر بەنی ئیسرائیلیەکان دروست ببێ و دەسەلات بکەوێتە دەستی فیرعەونەکان، خۆشی بەنی ئیسرائیلیەکانیش گۆڕا بۆ نەهامەتی و زەبوونی، چونکە هەستی خەڵکی میسر تەنیا لەوەدا نەمایەوە بەنی ئیسرائیلیەکان لە دەسەلات دووربخرێنەوە، بەڵکو لەوە زیاتر پەلیان هاوێشت و ئەو نەوەیەی هەر ویستی لەوەدا بوو تەنیا خۆی ئاغابێ و ئەوانی دی کۆیلە و خزمەتکار، کرا بە کۆیلە و خزمەتکاریان پێ دەکرا، ئاینی خوا لە داد و یەکسانی ئەوخۆشەویستیە بوو کە یوسف(علیه السلام) لە میسردا بلاوی کردەوە، ئەوان بە بەرژەوەندی و مادده پەرستیەکی رووت گۆڕیانەوە و وەکو پێشتر خەڵکی میسر باوەڕیان وەها بوو کە خوای میسر جیاوازە، ئەمانیش خوایان لە خوای جیهانەوە کردە خوای بەنو ئیسرائیل، بۆیە خەڵکی میسر لە کاردانەوەی خۆبەزلزانینی بەنو ئیسرائیل رقیان لە خوا بوویەوە و گەڕانەوە سەردەمی بت پەرستی .

کاردانەوەی خۆبەزلزانیان خۆ بە خوا دانانی فیرعەون ( فرنسیسی دووەم ) بوو، دەنا لە نێو نەتەوەکەی فیرعەوندا باوەڕی یەکتاپەرستی هەبوو، فیرعەون خۆی دانی بە بە خوایەتی خوا ناوە هەروەك بە هامان دەڵێ :

(( ابن لي صرحاً لعلي ابلغ الأسباب السموات فاطلع إلى إله موسى .. )) .

واتا : ئەی هامان قەلأ وکۆشکێکم بۆ دروست بکە تاوەکو بڕوانمە خوای موسا و بیبینم .

یان بە گەڕانەوەمان بۆ ئەو کاتەی خنکانی فیرعەون لە دەریادا، ئەو هەستە خەفە کراوەی فیرعەون دەبینین بەرامبەر بە خوا، بەڵام مامەڵەی نەشیاوی پێشوتری بەنی ئیسرائیل بەرامبەر میسریەکان بوویە هۆی سەرهەڵدانەوەی بیروباوەڕی بت پەرستی.
هەندێك ئێژن بەنوئیسرائیلیەکان ژمارەیان لە زۆربووندا بووە و ئەوەش لای فیرعەون و نەتەوەکەی مەترسی دروست کردووە و فیرعەونیش بڕیاری داوە نێرینە لە دایك بووەکانی بەنی ئیسرائیل بکوژێ .

بەڵام وەکو سەرچاوەکان باسی دەکەن و ئەوەشی زیاتر لە راستیەوە نزیکە، خەوبینینێکی فیرعەون بووە و خەولێدەرەوانیش ئاگاداری دەکەنەوە کە ئەودیەکی لە دایك بووی بەنی ئیسرائیل دەبێتە مایەی لە نێو چوونت، کوشتنی منداڵە نێرینە بەنی ئیسرائیلیەکانیش هەر بۆ ئەو خەوە ئەگەڕێتەوە، فیرعەونی ئەو کات فرەنسیسی دووەم دەبێ ، د . مایکل هارت دەڵێ : ناوی ئەوکاتی فیرعەون رەمسیسە و لە سەدەی سیانزەهەمی پێش زاین بووە و رەمسیس لە ساڵی ١٢٢٨ پ . ز مردووە و دەکاتە ئەو سەردەمەی کە موسا ( ر .خ ) تیادا ژیاوە [1]

دایکی موسا بە موسا سکی ئەبێ و منداڵبوونەکەشی شاراوە ئەبێ، لە ترسی ئاشکرا بوونی منداڵەکە و پاشان کوشتنی بە نیگایەك لە لایەن فریشتەوە ئەخرێتە روباری نیلەوە و خزمەتکارەکانی کۆشکی فیرعەون لە نیلدا ئەیدۆزنەوە و بە زۆر پێهێنانی ژنی فیرعەون، فیرعەون رەزامەند دەبێ کە وەکو کوڕی خۆیان لە ژیاندا بیهێڵنەوە .

---

[1] د . مایکل هارت : ١٠٠ ئاودار ، لا ٧٧ .

پاش ئاشکرا بوونی رەچەڵەکی موسا و گەورە بوونی و بینینی زبری وکوشندەیی خەڵکی میسر بەرامبەر نەوەی ئیسرائیل و کەوتنە ئەستۆی کوژرانی میسریەکی نەتەوەی فیرعەون، لە کاتێکدا موسا ویستی کوشتنی نەبوو ناچار دەبێ رووە و مەدیەن میسر بەجێ بهێڵێ، لە پاش مانەوەی چەند ساڵێك و ژنهێنان لە لایەن خواوە پەیامی پێ دەدرێت بۆ رزگارکردنی نەوەی ئیسرائیل و ملکەچی کردنی فیرعەون بۆ پەیامی یەکتاپەرستی و دەست هەڵگرتن لە چەوساندنەوە ، دیارە چیرۆکە قورئانیەکان لەم بارەیەوە زۆرن و هەرکەس بیەوێ دەتوانێ زۆرێکی لە بارەوە شارەزا بێ ، درێژەدانی ئێمەش تەنیا بۆ گەڕانە بە دوای سەرهەڵدانی یەهودیەت . خوای گەورە لە رێگەی موسای پێغەمبەریەوە نەوەی ئیسرائیل ئاگادار دەکاتەوە بۆ بەجێ هێشتنی خاکی میسر ، بە شاراوەیی میسر بە جێ دەهێڵرێ .

کاتێك تەماشای سەرچاوەکان دەکەین زاراوە قورئانیەکان دەبینین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە وشەی (( بني إسرائيل )) و ( یەهودیەت ) شێوە جیاوازییەکیان هەیە و مێژوو بۆ هەریەکەیان قۆناغێکی دروست کردووە ، تا بوونی نەوەی ئیسرائیل ئەم وشەیە ( جولەکە – یەهودیەت ) بوونی نەبووە، راستە ئەو وشەیە بەسەر شوێنکەوتووانی موسا وتراوە ، لە قورئاندا وشەی یەهود لەگەڵ وشەی بەنی ئیسرائیلدا هاتووە و هەردووکیان هەن، فرمانی ( یهود ) لە ( هاد ) ەوە هاتووە، وەکو ( هاد الرجل )

واتا : پاشگەزبوویەوە و تەوبەی کرد [1] ، موسا ( علیه السلام ) کە لە میسر دەرچوون و لە دەریا پەڕینەوە بەلای نەتەوەیەکدا تێپەڕین، بینیان نەتەوەیەکن بە دەوری ئاگردا دەسوڕێنەوە، ئەوانیش وتیان با ئێمەش وەکو ئەمانە خوایەکمان هەبێ و بیپەرستین، موسا تەوحید و خواناسی بە گوێدادان و وریای کردنەوە لە وەها هاوەڵ بۆ بڕیاردانێك، پاشان لە چوونی موسا بۆ کێوی ( طور ) و مانەوەی بۆ چل رۆژ،

---

[1]: الشهرستاني ، ابى الفتح محمد بن عبدالكريم بن ابي بكر ا حمد :الملل والنحل ، تحقيق : امير علي مهنا ، علي حسن فاعور ، لا ٢٠٥ .

سامیری بە خشڵ و ئاڵتونی هەندێك لە نەوەی ئیسرائیل گوێرەکەیان دروست کرد بۆ پەرستن، هۆکاری ناونانیان بە یەهود دەگەڕێتەوە بۆ پەشیمان بوونەوە ( توبة ) یان لەو مانگا پەرستیە [٢] ، خوای گەورەش دەفەرموێت : (( إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ )) [٣]

واتا :ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێنا و لە تاوانەکانیان پەشیمان بوونەوە ( هادوا – یەهودیەکان ) و گاور و سائیبیەکان لەوانەی باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی هێنا، ئەوا لای خوای گەورە پاداشتی خۆیان هەیە وترس وخەمیان بۆ نیە .

لە دوای ئەو هەموو نەهامەتیەی لە لایەن خەڵکی میسرەوە بەسەریان هات و ئەو بەختکاریەی موسا دای و پەڕینەوەیان لە دەریا و خنکاندنی فیرعەون لە پێش چاویان، وەڵامی ڕێزی خوایان بە پەرستنی بت و گوێرەکە پەرستی دایەوە،( حافظ ابن عساکر ) گێڕاوێتیەوە کە ( عباد المنقری ) لە حەسەنی بەسری گێڕاوێتیەوە کە ئەو گوێرەکەیە (( بهموت )) ی پێ وتراوە [٤] ، بە دەستی خۆیان ئەو گوێرەکەیان دروست کرد، هەندێ بۆچوونیش دەڵێ : ناو بردنیان بە یەهود دەگەڕێتەوە بۆ یەهوزای کوڕی چوارەمی یەعقوب ( علیه السلام )، بەڵام بە ڕوانینە قورئان دەبینین کە باس لە جولەکە دەکات وشەی ( یهود ) بەکار نەهاتووە و ئەوەشی لەو وشەیە وەرگیرا بێ، تەنیا لەو کاتانەدا نەبێ کە دەستیان لە گوێرەکە پەرستی هەڵگرتووە و پێش ئەو حاڵە لە قورئان دا وشەی ( بنی إسرائیل ) هاتووە [٥] ، کە باس لە گوێرەکە پەرستیەکەیان دەکات دەفەرموێت : (( فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ )) .

---

[٢] ماهر احمد آغا : الیهود فتنة التاریخ ، لا ٢٧ .

[٣] سورەتی : البقرە ، ئایەتی ٦٢

[٤] ابن کثیر : تفسیر القرآن ، ج٥ ، ٦ ، لا ٨٧ .

[٥] ڕۆژنامەی : ڕێگای یەکبوون ، و: عبداللە گەرمیانی : هۆکاری ناونانی بەنو ئیسرائیل بە یەهوود ، ژ ٨٦ ، ١٦ نیسانی ٢٠٠١

لێرەوە دەبینین قۆناغێکی دیکە لە مێژووی بەنی ئیسرائیل دروست دەبێ و بەچوونیان بۆ زەوی کەنعانیەکان، خێڵی بەنی ئیسرائیل بە یەهود ناودەبرێ و خەڵکانێکی دیکە دێنە ناو ئەو ئاینەوە، کەواتا دەتوانین بڵێین بەنی ئیسرائیل بازنەکەی بەرتەسکترە لە یەهودیەت، هەرکەس بیەوێ دەتوانێت ببێتە یەهودیەت نەك بەنو ئیسرائیل [٦]

رووداوی سەیر لە مەڕ جولەکە دەبینرێ ، بۆ بینینی خوا تانەیان لە موسا داوە و داوای بینینی خوا دەکەن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت :

(( وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ )) [١]

واتا: ئێوە کە وتتان ئەی موسا باوەڕت پێ ناهێنین بەوەی ئەوەی لە تەکیدا قسە و گفتوگۆ دەکەی خوا بێ، تا ئەو کات خوا نەبینین، تا ئەو کات لە وەڵامی ئەو داواکاریە سەیرەتاندا هەورە تریشقەتان بەرکەوت ( کە دای لە کێوی طور ) و بە چاو ئەو رووداوەتان دەبینی. بۆ میللەتێکی ئاینزای وەکو جولەکە کە چەندان پێغەمبەریان هەبووە و موسای پێغەمبەریش لە نێویاندا بێ وەها پێداگریەك شیاوی ئەوەیە پێغەمبەر دڵتەنگ بکات، بۆیە خوای گەورە بۆ هەڕەشە کردن لێیان کێوی ( طور ) ی بەسەریاندا بەرز کردەوە، ئەوانیش لە ترسا پەشیمان بوونەوە جارێکی تر پەیمانی گوێڕایەڵیان بە خوا دایەوە، دەیان جار پەیمانیان شکاند و موسا ( علیه السلام ) یان سەرپێچی کرد و بە سەرپێچی شوێنکەوتووانەوە کۆچی دوایی کرد .

خوای گەورە چەندان پێغەمبەر و سەرکردەی بۆ یەهودەکان نارد بۆ راپەڕاندنی ئاینی خوا، گەلێکی زۆر لە سەر شت رۆیشتوو، فرەوێژ لەگەڵ پێغەمبەران، لە زەوی سەرگەردانیدا چل ساڵ خوای گەورە سەرگەردانی کردن، بۆ چوونە شارێکەوە کە بت پەرستی و بێباوەڕی بەرامبەر خوا تیایدا دەکرا بە موسایان وت: تۆ بڕۆ لەگەڵ خواکەتدا لەگەڵیاندا بجەنگی و ئێمەش لێرەداین !

---

[٦] هەمان سەرچاوە .

[١] سورەتی البقرە ، ئایەتی : ٥٥ .

ئەوان کە لە میسر بوونەوە زەوی کەنعان مایەوە تیایدا بژین، چوونە زەوی کەنعانیش بۆیان سەخت بوو ، چونکە کەنعانیەکان دوای چەندان ساڵ لە دەرچوونی یەعقوب ( علیه السلام ) و کوڕەکانی رەزامەند نەبوون جارێکی تر بگەڕێنەوە ئەو خاکە و ئەمجارە بەسەریاندا خۆ بنازن، جولەکەکانیش نەیاندەتوانی بەو پەیامەی پێیانە باوەڕیان پێ بهێنن،ئەو هەموو دەردە سەریەی لە رابردوودا بەسەریان هات بەو خەڵکە کەنعانیانەیان رژاند، هەروەکو (( دیورانت )) مێژوو نووسی ئەوروپی بەناوبانگ و خاوەن مەوسوعەی (( قصة الحضارة )) لە بارەی ستەمی عیبرانیەکان ( جولەکەکان ) بەرامبەر کەنعانیەکان ئەڵێ : شکست هێنانی عیبرانیەکان بە کەنعانیەکان نموونەیەکی روونی کۆمەڵێکی برسیە بۆ سەر کۆمەڵێکی ئارامگرتووی گیرساو، عیبرانیەکان زیاد لە سنور کەنعانیەکانیان کوشت، ژنەکانیان کردە دەسکەوت و رووباری خوێناویان دروست کرد، کە دەستیان بەسەر یەکێك لە شارەکان دا گرت دوانزە هەزاریان کوشت و شارەکەیان سووتاند و فەرمانڕەوا شارەکەیان لە خاچدا ...... بەم شێوازەی کە شوێنەواری سۆز و بەزەیی تیادا نابینین جولەکە دەستیان بەسەر زەوی بەڵێن پێدراودا ( الأرض الموعودة ) گرت [٢]

وەکو پێشتر باسمان کرد، جولەکە لە جیاتی ئەوەی پەیامی ئاشتی و برایەتیان پێ بێت، هەستی بە گەورە زانینیان هەڵگرتبوو، خۆیشیان بە گەلی هەڵبژێردراوی خودا دەزانی، دوورە پەرێزی سەردەمی میسریانیش هەر لە خۆ گەورە نواندنەوە سەرچاوەی گرتبوو، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی شوێنیان لە میسر نالەبار بکات و میسری و فیرعەونەکانیش لێیان دڵرەقانە بجوڵێنەوە و لە قەوارەی کۆمەڵایەتیاندا بونەوەرێکی نامۆ تەماشایان بکەن [٣]

---

[٢] د . احمد الشرباصي : يسالونك في الدين والحياة ، بةشي ٧، لا ٦١٩ ، ج ١ ، دارالجيل – بيروت ١٤٠١ ه – ١٩٨١ م .

[٣] الرفاعي ، فؤاد بن سيد عبدالرحمن : حقيقة اليهود ، لا ٢١ ، ٢٢ .

گەلی جولەکە زۆرێک کاری دژکارانەیان بەرامبەر پەیامبەر و پەیامنێردراوەکانی خوا ئەنجام داوە، بۆیە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاوەها رەخنەیان دەکات : (( وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ))

واتا: ئاخۆ لە بیرتانە کە ئێوەمان لە نەتەوەی فیرعەون رزگار کرد، کە ئەوپەڕی سزای سەختی دەدان و کوڕەکانتانیان دەکوشت و ئافرەتەکانتانیان دەکردە خزمەتکار، بە راستی بەڵایەکی گەورەتان لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ هەیە .پەیامی نێردراوی خوا بۆ یەهود تەورات بوو، تەورات لە ماوەیەکی زۆری دوای موسا نوسراوەتەوە، ئەوەش دوای دروستبوونی تەماحی دەسەڵات و خوێن رێژی بەسەر زەوی کەنعاندا، بۆیە تەورات زیاتر مادییانە نوسراوەتەوە و سیاسەتێکی دوور لە روح و سۆزی تیادا کۆکراوەتەوە، دەوترێت کە یەکێك لە زاناکانیان دوای راپێچکردنییان بۆ زەوی بابل و ژێر دەستەییان لەو خاکەدا بیری کردۆتەوە کە پێویستە بۆ گەلی جولەکە پەیامێك هەبێ، شارەزا بووە لە هەندێ ماددەدا و بە جولەکەکانی وتووە کە دەچێتە دەرێ بۆ ئەوەی لە ئاسمانەوە پەیامی موسای بۆ دابەزێ، رۆیشتووە و لەسەر چەند پارچە پێستێك و بە شلەیەك کە دوای ماوەیەکی زۆر نەخشی دەردەکەوێ، لەوەی لە تەورات زانیویێتی و ئارەزووی بووە لەو ماددە شلە لەسەر پارچە پێستێك نوسیوێتی و پاشان بە جولەکەکانی وتووە لەسەر ئەم پارچە پێستانە بۆ چەند رۆژێکی تر پەیامی خوا کە تەوراتە جارێکی دیکە دەنوسرێتەوە، دوای چەند رۆژێك و وشك بوونی پێستەکان نوسینەکان دەرکەوتووە و باوەڕیان پێی هێناوە، لە پاڵ ئەوەشدا تەلمود و چەند کتێبێکی تریان هەیە و رەگەزپەرستانەیە، بە کتێبی خوایان داناوە و حاخامە دەمارگیرەکانیان بۆیان زیاد کردووە و لەسەر بیر و باوەڕی کوشتن و ستەمکاری و پێداگری لەسەر نەهێشتنی جگە لە جولەکە تاکەکانیان پەروەردە دەکات [1]

---

[1] مصباح محجوب : بيت العنكبوت ، لا ١٤١

له ئینجیلی بەرنابا هاتووه که عیسا ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) باسی لەو چاکانەی دەکرد که خوای گەوره بۆ ئیسرائیل کردی لەوەی به بەندەکانی خۆی ( یوسف و هارون و موسا ) ی دا بەوەی فیرعەونی له نیلدا خنکاند و دوو سەد و بیست پادشای کەنعانی و مەدینیەکانی تێکشکاند، دەپرسێ : ئاخۆ گەلی ئیسرائیل چۆن مامەڵەیەکیان بەرامبەر پەروەردگار کرد ؟ چەند پەیامبەریان کوشت ؟ چەند پەیامبەری تریان نابووت کرد و سەرپێچی شەریعەتی خوایان کرد، له خوا لاتاندا و روتان کرده بت پەرستی ئەی کاهینەکان [2]

بت پەرستی و هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردن، هۆکاری له نێو بردنی زۆرێك گەلان بووه و هۆکاری ناردنی پێغەمبەرانیش بووه بۆ نەتەوەکانیان، گوێڕایەڵی کردن بۆ جگه له خوا و پەیڕەو کردنی بەرنامەیەك جگه له بەرنامەی خوا کردنەوەی بەرەیەکه دژ به خوا

هەروەکو له ئینجیلی بەرنابادا هاتووه، که جارێکیان عیسا ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) بۆ کۆمەڵێك قسەی دەکرد، زانایەك وتی : ئەی مامۆستا زۆرێك له بارەی بت پەرستیەوه قسەت کرد وەکو ئەوەی گەلی ئیسرائیل کۆمەڵه بتێکیان هەبێ، بەراستی بەرامبەریان ناخۆشت کرد

عیسای مەسیحیش ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) له وەڵامیدا دەفەرمووێت : باش بزانه که ئەمڕۆ لەنێو گەلی ئیسرائیل بتی له دار داتاشراو بوونی نیه، بەڵکو بت گەلێکی لاشەیی هەیه [3]

یەهودیەت هەر له کۆنەوه که ئاینەکه بۆ نەوەی ئیسرائیل و پاشان بووەته ئاینی ئەو کەسانەش که شوێنی کەوتوون له میللەتانی دی و بوونی هەندێ دەسەڵاتیان له میسر و پاشان کوشتارکردنی خەڵکه رەسەنەکەی

---

[2] انجیل : برنابا ، ترجمه : . خلیل سعاده ، تحقیق محمد عبده ، لا ١٠٤ ( ٦٨ : ١٧،١٨،٢١،٢٢ ) .

[3] هەمان سەرچاوه ، لا ٤٨ .

فەلەستین کە زەوی کەنعان بووە و کوشتارێکی رەگەز پەرستانەیان کردوون نەك داوای باوەڕهێنان کە لەوەشدا موسا و هارون لێیان بێ ئومێد بوون، لەباوەڕی خۆیاندا شت گەلێکیان دروست کرد کە خوا و پەیامبەرەکانی لێ ی بە دوور بوون، هەروەکو د. علی عزت بیچۆفیتش لە کتێبەکەیدا (( الاسلام بین الشرق والغرب )) باس لە ماددیەتی یەهودیەکان دەکات و دەڵێ: یەهودییەت بەهەشتێکی زەمینیان دەوێ و وەهایان داناوە کە پەرتووکەکەی ئەیوب بریتی یە لەو دادپەروەریەی کە پێویستە لەسەر زەوی بێتە دی نەك لە جیهانێکی تردا [1]

بندکت سپینونزاش کە فەیلەسوفێکی جولەکەیە، ئەوە دوپات دەکاتەوە کە تەورات لە بارەی نەمریەوە هیچ باس ناکات و مەملەکەتی خوداوەند دەبێ لەسەر زەویدا بێت [2]

بۆیە جولەکە زۆر شارەزاییانە دەستکاری پەیامە ئاسمانیەکانیان کردووە و لە ناودا ئاسمانیانە هێشتوویانەتەوە و ناوەڕۆکەکەشی هەر باس لە شەڕ وکوشتار کردنە و شتێکیان نەهێشتووەتەوە لە ئەخلاقیاتی مرۆ بدوێ.

پەروەردگاری جووەکان بەو پێیەی لە ( الأسفار الخمسة ) دا هاتووە، وا دەردەکەوێت خوداوەندی جەنگە و باس لە دەستبەسەراگرتن و داگیرکردنی وڵات دەکات و دەڵێت ئەو خاکەی جووەکان ( جولەکەکان ) دەستیان بەسەرا گرتووە تەنها موڵکی خۆیەتی، ئەو خودایەش لە پێناوی سەرکەوتنی گەلەکەیدا جۆرەها رێبازی دڕندانە دەگرێتە بەر کە پڕن لە توندوتیژی و دڵرەقی و دەشکاتە رادەی ستەمێکی تۆقێنەر، بەلاّم ئەوە زۆری نەخایاند، کردیانە خوداوەندێکی تر کە بە شێوازێکی ئاشتیانە لە دەستی

---

[1] علی عزت بیجۆفیتش : الاسلام بین الشرق والغرب ، لا ٢٧١ .

[2] علی عزت بیجۆفیتش: الاسلام بین الشرق والغرب ، لا ٢٧١

دوژمنەکانیان دەیانپارێزێ و لە وەرزی بارانبارینیشدا بارانیان بۆ دەبارێنێت و باشیان بۆ دەستەبەر دەکات لەو کاتەی پێویستیان پێیەتی، خۆریشیان بۆ دەستەبەر دەکات لەو کاتەی زۆر پێویستیان پێیەتی [٣]

دە بڕوانە چۆن خوایەکیان بۆ خۆیان دا هێناوە خۆیان چۆن بن ئاوەها وێنای خوا دەکەن، راستە ئەوان کە چوونە زەوی کەنعانەوە لەلاچۆی کەنعانیەکان و ئەوانی دی کرد، بۆیە لە وەها کارێکدا دەبێ وێنای ئەو کارەیان بکەن و پاساوێکیان پێ بێ و بیکەنە وانەیەك بۆ نەوەکانیان و میراتبەری خوا و وێنەیەکی خراپ بە خوا بدەن، خوایان کە ئاشتیانە وێنا کردووە هەمان فروفێڵەکانی سەردەمی لاوازیانە و دوو روانە و ماستاوچێتی بەردەستی کۆرش و دەسەلأتدارانی میللەتانی دی بووە، شارەزا بوون لەوەی خوایەك لە مانگا وێنا بکەن ا ج جای ترسێنەری بیناسێنن، هەروەکو ئێستایان بە چەندەها چەك و تەقەمەنی عەنقودی و دەیان چەکی تۆقێنەر هەڕەشە لە هەناسە و ژیانی میللەتان دەکەن .

هەروەکو مەسیح ( علیه السلام ) باسی لە نەوی ئیسرائیل کردووەو فەرموویەتی : خوا نەبوونیان دەکات، چونکە بەهۆی دوژمنکاریەوە دوژمنایەتیم دەکەن و راستیان ناوێت، ئاخۆ ئەمانە بە کارەکانیان چۆن پەرتوکەکانی موسا و داودی پێغەمبەر و خۆشەویستیان شێواند [٤]

ئەوان زۆر بە رەخنەن بەرامبەر بە خوا، حاخام ئیسحاق رەخنە لە تەورات دەگرێ کە دەڵێ: لە سەرەتادا خودا ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد و جولەکەی دروست نەکرد [٥]

---

[٣] : سلێمان مەزهەر: چیرۆکی ئاینەکان ، و – لوقمان حاجی قادر ، ل ٣٥ ، چ یەکەم ، دەزگای پەخشی سەردەم ٢٠٠٨ .

[٤] انجیل برنابا : لاپەڕە : ٢٤٦ .

[٥] بڕوانە : من الفکر الصهیوني المعاصر : مرکز الأبحاث / منظمة التحریر الفلسطینیة ، بیروت – لبنان ١٩٦٨

ئەبراهام لیۆن دەڵێ: جەنگی نێوان رۆمان و جولەکە بوویە مۆزی پەرتەوازەیی جولەکە و بەو جۆرە مانەوە و مەسیحیەتش سەری نەخستن. هەرەسهێنانی ئەمپراتۆریەتی رۆمان بوویە هۆی زیاتر گۆشەگیر بوونی جولەکە لە دوای سەرکەوتنی تەواوی مەسیحیەت لە رۆژئاوا، لە سەردەمی بەربەیەتیشدا جولەکە تەنیا چەند کۆمەڵێك بوون و لە بوارە جیاوازەکانی ئابوریدا وەکو کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانیدا کاریان دەکرد. داپلۆسینی ئاینی پاڵنەریان بوو بۆپەنابردنی بەر بازرگانی و سوو، لە هەڵمەتەکانی خاچپەرستیشدا زیاتر رووبەڕووی داپلۆسین بوونەوە و رۆڵی ئابوریان مایەی رقی زیاتری مەسیحیەکان بوو لە دژیاندا [٦]

ئەم گەلە، کارە نامرۆڤانەییەکانیان هۆکار بوو تاوەکو خاوەن خۆیان نەبن و بڕیار و چارەنووسی سیاسیان نەبێ.

د . غۆستان لۆبۆن لە کتێبەکەیدا ( الیهود في تاریخ الحضارات الأولی حقیقیة مضادها ) ئەڵێ: جولەکە نە هونەر نە زانست و پیشەسازییەکی نەبوو و هیچ شتێکی نەبوو شارستانیەت دروست بکات و لە بونیاتنان و زانینی مرۆییدا هیچ هارکاریەکیان نەکردووە [١]

هەروەکو جوفینال ( Juvenal ) لە بارەیانەوە ئەڵێ: تەنیا بۆ دروست کردنی ناخۆشی بۆ گەلان لە دایك بوونە.

ئەوان وەها دەزانن کە شەریعەت تەنیا یەك شتە و ئەوەیە کە لە موساوە هاتووە، ئەوەش تەنیا کۆمەڵە ڕێسایەکی عەقڵی و حوکمە بەرژەوەند خوازیەکانە .

---

[٦] المفهوم المادي للمسألة اليهودية : ابراهام ليون . ترجمة : عماد نويهض ، لا ٢١ ، الطليعة ، بيروت ١٩٦٩

[١] بيت العنكبوت : مصباح محجوب ، لا ٣٤

خوای گەورە لە وەها مەبەستێکی شاراوە لای جولەکە،پێغەمبەر و موسڵمانان ئاگادار دەکاتەوە و رایدەگەیەنێ کە چاوی دوژمنکارانەیان لێ دامەخەن کە دەفەرمووێت : ((لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ )) [1]

واتا: ئەوانەی دوژمنایەتی سەختیان بۆ باوەڕداران هەیە، جولەکە و هاوەڵپەیداکارانن، ئەوانەش کە زۆر سۆزیان بۆ باوەڕداران هەیە ئەوانەن کە دەڵێن ئێمە نەسارایین ( گاورین )، قەشە و راهیب گەلێکیان تیادایە کە خۆبەگەورە نازانن .

ئەوەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە دوژمنایەتی جولەکە دەخاتە روو بەرامبەر ئەو باوەڕدارانەی شەریعەتی خوا بە کردەوە بەرز رادەگرن، ئەوان لە کۆنەوە وەهایان خەملاندووە کە پارێزەری شەریعەتی خوا و شوێنکەوتەی ئیبراهیمن ( علیه السلام )،خوای گەورەش وەڵامی ئەو بانگەشە پوچە دەداتەوە و روونیدەکاتەوە کە باوەڕداران شیاوتر و لە پێشترن بە شوێنکەوتنی ئیبراهیمی پێغەمبەر (علیه السلام ) کە جەنگی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانی کرد، خوای گەورە دەفەرمووێت : (( إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ )) [2]

واتا : ئەوانەی شوێنکەوتە و لە پێشترن بۆ ئیبراهیم، ئەوانەن کە شوێنکەوتەن و ئەم پێغەمبەرە و باوەڕدارانەیە و خواش دۆست و سەرخەری باوەڕدارانە .

---

[1] سورەتی ( المائدة ) ، ئایەتی ٨٢ .

[2] سورەتی ( آل عمران ) ، ئایەتی ٦٨

دوژمنایەتی جولەکە بۆ پێغەمبەران و باوەڕداران زۆرێک سەختتر بۆتەوە و بوارە جیاوازەکانی داگرتووە، ئەوان بە درێژایی مێژوو کار و قسەیەکیان ئەنجام نەداوە مایەی نەهێشتنی جیاوازی و دوژمنایەتی بێت .

هەر ئەو مامەڵە نالەبارەیانە سینیك ( Seneque ) دەڵێ : جولەی ڕەگەزی تاوانبارە،یان کنیلین دەڵێ : جولەکە ڕەشبینی مرۆڤی دیکەیە .

لە قۆناغی سەرمایەداری سەدەکانی ناوەڕاست بە پێدانی قەرزی سور ( ریبا ) جەماوەری ئەڵمانیا و ئیتالیا لە پیشەوەر و کرێکاریان بەکارهێنا.

بۆ هەموو کارێك ئەو بیرانەیان هەبوو کە لە پرۆتۆکۆڵە ڕق دارێژراوەکەیاندایە و دوژمنکارانە دژ بە هەموو نەتەوەکان وەستاونەتەوە،بە تایبەت دژ بە پێغەمبەرانی خوا

( شاهین مکاریوس ) ی لێکۆڵەری ئەمریکی لە ( تاریخ الاسرائیلین ) مێژووی ئیسرائیلیەکان – دەڵێ جولەکە تا کاتی دەرچوونیان لە میسر مێژووی بنەماڵەیەکی بچووکە، گەشەی دەکرد تا بوویە هۆزێکی گەورە کە قەوارە و حکومەتی نەبێ ، بە کەسێکیشەوە کە کاروباریان بکات [1] .

ئەو میللەتە تەنانەت بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕیان و شێواندنی کتێبی خوا پەنایان بردۆتە بەر زۆر بیری بۆگەن، ئەوان دەڵێن کە ( لوط ) پێغەمبەری خوا شاری بەجێهێشتووە و ڕویکردۆتە ئەشکەوت و لەوێدا گیرساوەتەوە ، دوو کچەکەی لەتەکدا بووە، کچی بچووك بە کچی گەورەی وتووە باوکمان پیر بووە و بۆ ئەوەی وەچەمان لێ هەبێ با سەرخۆشی بکەین و لە تەکیدا جووت بین، بۆیە دوای سەرخۆش کردنی، کچی گەورە لە گەڵیدا جووت دەبێ پاشان بچووك، بۆ شەوی دواتر هەمان شت دووبارە دەکەنەوە و لە باوکیان سکیان پڕ دەبێ و دوو کوڕیان دەبێ ناوی دەنێن ( مواب عمون )،

[1] بروانە : الموسوعة الميسرة للأديان والمذاهب المعاصرة .

ئاخۆ دەکرێ پێغەمبەر و نێردراوێکی خوا کە خوا ڕێزی لێ ناوە وەها کارێکی قێزەونی گەورە لە کۆتایی تەمەنیدا ڕوویدات، پاشان لە تەوراتدا تۆماری بکات و بۆ گەلانی بگێڕێتەوە ؟ ! [2]

ئەوان بۆ هیچ کارێك بوارێك بۆ ئەخلاق ناگێڕنەوە ، هەروەکو ئیسحاق دویتشر ( ١٩٠٧ – ١٩٦٨ ) دەڵێ : کەسی جولەکە هەر جولەکەیە با هەر تاوانێکی ئەنجام دابێ [3] ،

هەر ئەوانەن کە مناحم بێگن ئەڵێ : ئێمە کوشتار دەکەین، کەواتە ئێمە بە خوێن هەین بە ئاگر و ئاسن و دوکەڵ و بە جۆرێکی نوێ ی مرۆڤایەتی، جۆرێکی تەواو نادیار لە جیهان ، زیاتر لە هەزارو هەشت سەد ساڵە جولەکە لە هەر شت جەنگاوەرە، پێویستە لێرەوە دەست پێ بکەین : لە خوێن و ڕەگەز و نەوەیەکی شانازی کار لە دایك دەبێت بە هێز و خاوەن پیاوەتی [4]

گیانی تۆڵەکردنەوە بۆ نەریتی باوی جولەکە و خراپەکاریەکانیان لە خراپەکاریەکانی ڕابردوویانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە لە بەرامبەر پێغەمبەراندا پێ ی هەڵساون، ئەوەتا عیسای پێغەمبەری بەنو ئیسرائیل بەدەم گریانەوە ئەڵێ : ئەی ئەورشەلیم، ئەی ئیسرائیل من بۆت دەگریم، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەت نازانی، حەزم دەکرد بتهێنمە لای سۆزی خوای دروستکارت، هەروەکو چۆن مریشك جوجەڵەکانی دەخاتە ژێر باڵی خۆی و تۆ نەتویست، بۆیە خوای گەورە دەڵێ : ئەی شاری دڵڕەق من بەندەی خۆمم بۆ ناردی تا بتگۆڕێ و پەشیمان بیتەوە، بەڵام ئەی شاری پەشێو لە بیرت کرد خوا بۆ ئیسرائیل چی بە میسر و فیرعەون کرد، ئەوە لە داهاتوودا زۆر

---

[2] بڕوانە : هداية الحيارى في أجوبة اليهود والنصارى ، لا ١٣٩ ، لإبن القيم الجوزية ، حققه و علق عليه سيد عمران ، دار الحديث القاهرة ١٤٢٢ – ٢٠٠٣ م .

[3] الموسوعة النقدية للفلسفة اليهودية ، لا ١١ ، د . عبدالمنعم الحنفي – دار الميسرة – بيروت ١٩٨٠

[4] گۆڤاری ڕوناکبیر : دیاردەی توندڕەوی ئاینی لای بەنی ئیسرائیل . بەهادین ئەحمەد ، ژ ٣ ، ئەیلولی ٢٠٠٢ ز .

دەگریی تاوەکو بەندەکەم لاشەت لە نەخۆشی چارەسەر بکات و ئێستا دەتەوێت بەندەکەم بکوژی لەبەر ئەوەی دەیەوێت دەروونت لە تاوان پاك بکاتەوە، وا دڵنیای کە تۆڵەم ناچەژی و هەتا هەتایە دەژی و لە بەرامبەردا سەرکەش دەمێنی، نەخێر سەرکردە و سوپا گەلێکت دەنێرمە سەر بەمێزەوە و گەورەیی تۆیان پێ دەدەم کە هێز و سەرکەشیت بخەنە دۆزەخەوە، لە پیر و بێوەژن و منداڵەکانیش دەست هەڵدەگرم و دەتاندەمە دەست برسێتی و شمشێر و ریسوایی و ئەو هەیکەلەش کە بە سۆزەوە بۆی دەڕوانم لەگەڵ شاردا وێران دەبێ و لە نێو نەتەوەکاندا دەبنە گێڕانەوە وگاڵتە جاڕ و پەند [*]

سەرەنجامی ئەو ژیانە سەرکەشیە و دۆڕاندنیان لە مێژوودا، ئەو باوەڕەی بۆیان دروست کرد کە هەر چ دەکرێت بەرامبەر بە نەتەوەکان (جوریم) کە جگە لە جولەکەکان ئەنجام بدرێ بەو پێ یەی ئاینی یەهودیەت ئەوەی بە رەوا داناوە و پاساوی داوە بەوەی گەلانی دیکە دروستکراون بۆ ئەوەی خزمەتکار و کۆیلەی جولەکە بن، لەسەر هەر جولەکەیەکیش پێویستە ئەو مافە زەوتکراوە بگەڕێنێتەوە کە لە خزمەتکاری گەلاندا خۆی دەبینێتەوە بۆ کۆیلایەتیکردن بۆ جولەکە ! ئەوانەی لە نێو گەلاندا گەلی هەڵبژێردراوی خوان ! .

▣ تەلموددا هاتووە : (( جولەکە لای خوا و فریشتەکان خۆشەویستن و لە رەگەزی خوان، هەروەکو منداڵ لە رەگەزی باوکێتی، هەریەك لە جولەکەیەك ببورێ وەکو ئەوەیە لە خوا ببورێ، مردن پاداشتی کەسێکە لە جولەکەیەك بدات، گەر بوونی جولەکە نەبووایە لەسەر زەوی، ئەوا فەڕ و بەرەکەت هەڵدەگیرا و خۆر دادەپۆشرا و باران نەدەباری . جولەکە لە نەتەوەکانی تر ( ئوممەییەکان ) رێزدارتن وەکو رێزی مرۆڤ بەسەر ئاژەڵاندا،

---

[*] الانجیل : برنابا ، لا ٢٩٦

ئوممەمیەکان هەروەکو سەگ و بەرازن ماڵەکانیشیان وەکو خانی ئاژەڵە پیسەکانە، حەرامە بۆ کەسێکی جولەکە بەرامبەر ئوممەمیەك [1] سۆزی هەبێ، چونکە ئەو ئوممەمیە دوژمنی خۆی و خوایە، خۆپاراستن و مودارات کردنی ئومەمی رێگە دراوە لە کاتی پێویستدا ئەویش بۆ دورخستنەوەی مەترسیەکەی، هەر کارێکی چاکە جولەکەیەك لەتەك کەسێکی ئومەمی ئەنجامی بدات ئەوە تاوانێکی گەورەی کردووە، هەرشتێك جولەکەیەك بەرامبەر بە ئوممەمیەك ئەنجامی بدات ئەوە لە خوا نزیك بوونەوەیە و خوا لەسەری پاداشتی دەدات، ریبایەك کە زۆر نەبێ لەتەك جولەکەدا ئاساییە هەروەکو موسا وای وتووە و ریبای زۆریش لەتەك جگە لە جولەکەدا رەوایە، ئەوەی لەسەر زەویدایە موڵکی جولەکەیە، ئەوەشی لە ژێر دەستی ئوممەمیەکاندایە ئەوا لە جولەکە داگیرکراوە و پێویستە بەهەر شێوازێك بێ لێ یان وەربگیردرێتەوە [2]

ئەمە لە تەلمووددا نوسێنراوەتەوە ! کە لە پێشتردا باسمان کرد بەوەی جولەکە وەهای باوەڕ دەکەن تەوراتی زارەکی یاخود ئەو وتە و ئامۆژگاریانەیە کە موسا بە جولەکەکانی وتووە و دوای ساڵانێکی دوور و درێژ لە کۆچی دوایی موسا ( علیه السلام ) نوسراوەتەوە . ئەمە ئەو پەیامە شەڕخوازیەیە کە خراوەتە سەر پەیامێکی ئاسمانی، بۆیە سەیر نیە کە ژیانی مرۆڤ و گەردوون بە ئاگری جەنگ وێران بێ، لە سەرووی هەموویەوە دوو جەنگە جیهانیەکە و کێشەی ئەمڕۆی جیهان و بێ بەشکردنی گەلان لە ئازادی و سەربەخۆیی و بڵاوکردنەوەی بیری کرمۆڵ و دۆشدامانکردنی مرۆڤ لە رووداوەکانی رۆژ و سەردەمەکەی !

---

[1] ئوممەمی ( جویم ) بە هەموو نەتەوەکان ئەڵێن جگە لە ئاینزای یەهودیەت . نوسەر .

[2] الخطر اليهودي ، بروتوكولات حكماء صهيون : محمد خليفة التونسي ، لا ٦٠ ، ﻁ ١ ، ١٤٢١ – ٢٠٠٥ م .

# بەشی سیٚ یەم

## ئاینی نەسرانیەت ( مەسیحیەت )

### باسی یەکەم

### عیسا ( علیه السلام ) و ئینجیل

### باسی دووەم

### نەسرانیەت دوای عیسا ( علیه السلام )

## باسی یەکەم

## عیسا ( علیه السلام ) و ئینجیل

قسە کردن لەم بەشەی تایبەت بە عیسا ( علیه السلام ) و ئینجیل پێویستە لە دوو لایەنەوە بێ، لایەنێکیان تایبەت بە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێ ) و لایەنێکی دیکەش تایبەت بەو پەیامەی خوای گەورە بۆی دابەزاند و ناوی لێنا ئینجیل .

عیسا ( علیه السلام ): ئەو پێغەمبەرەیە کە لە دایکێکی باوەڕداری پاك بە ناوی مەریەم و بەبێ هیچ پەیوەندییەکی رەگەزی و بە ویستی خوا لە شاری ( الناصرە ) ەی فەلەستین لە دایك بووە، بەنو ئیسرائیل پێغەمبەری زۆریان بۆ هاتووە، بە دەستی خۆیان شەهید کراون یان بە درۆ خراونەتەوە یان گوێڕایەڵیەکی تەواویان بۆ ئەنجام نەدراوە، خوای پەروەردگار عیسا وەکو دوا پێغەمبەری بەنوئیسرائیل دەنێرێ و وەکو پێغەمبەرێك بەو نەتەوە ئاینزایە دەیناسێنێ بۆ زیندووکردنەوەی ئەو پەیامەی خوا کە بە پێغەمبەرانی پێشوتر نێردرابوو شوێنەوار و کاریگەریەکەی لەسەر دەستی ئەحبارەکانی ( زاناکان ) ی جولەکە شاردرا بوویەوە یان شێوێندرا بوو، هەروەکو عیسا دەفەرمووێت:من تەنیا بۆ ماڵی گومڕای ئیسرائیل هاتووم [1]

خوا بە پێغەمبەرێتی بۆ جولەکە ناردی و لە دایکێك و بێ باوك خولقاندی و هەر لە کۆرپەیی هێنایە گۆ، بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو تانەدانەی بەنوئیسرائیل بداتەوە، کە لە مەریەمی دایکی دەیانگرت و بەرامبەر لە دایك بوونی ئەو ، واتە عیسا ( علیه السلام ) و بە داوێن پیسی کردن قسەیان لەسەر دەکرد .

---

[1] انجیل متی : ١٥ : ٤ .

هەندێ لە پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا بە دوو ناویی ناویان هاتووە : وەکو ئیبراهیم بە خلیل الله ( دۆستی خوا ) ، موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) بە ئەحمەد و هەروەها عیسا بە ( المسیح )، ئەم ناوانەی دووەم رێزگرتن و گەورە راگرتنە لە لایەن پەروەردگارەوە بەرامبەریان، د احمد الشرباصی لەبارەی وشەی ( المسیح ) ەوە ئەڵێ : زەیتێکی پیرۆزە کە زەیتی زەیتوونە یان لە بەرئەوەیە کە خوای گەورە لە رێگەی جیبریلەوە ( علیه السلام ) دەستی بەرەکەتی خستۆتە سەر، یان تاوانەکانی لە بەرامبەردا سڕیوەتەوە ( مسح )، یان خو رەوشتە ناشیرینەکانی لە بەرامبەردا نەهێشتووە [٢]

هەندێکی دیکەش ئەڵێن لە ( سیاح ) ە وە هاتووە و عیسا ( علیه السلام ) زۆرترین کەسە بۆ بانگەوازەکەی گەڕابێ، بەڵام ئەوەی دواتر بۆچونێکی تەواو نیە، بەڵکو ئەوە تەواوترە کە پەیوەندی بە نەهێشتنی تاوان و خو رەوشتە ناشیرینەکانەوە هەیە، واتا وەکو وەسفێکی جوانە بۆ هەڵگرتنی خەسڵەتێکی جوان کە خوای گەورە پێغەمبەرەکانی خۆی پێ دواندووە .

خوای گەورە لە قورئاندا زۆرێك باسی عیسای مەسیحی کردووە ، ( علیه السلام ) وەکو دەفەرموێت :

((لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَاء وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) [٣]

---

[٢] الشرباصي ، د . ا حمد : يسالونك في الدين و الحياة ، ج ٧ ، ٤١٩ .

[٣] سورەتی المائدة ، ئایەتی ١٧

واتا : ئەوانە بێ باوەڕیان کرد کە وتیان مەسیحی کوڕی مەریەم خوایە، ئایە گەر خوا ویستی بێ کە مەسیح و مەریەمی دایك و هەرچی لەسەر زەوی هەیە لە نێوببات، مەسیح دەتوانێ بەرپەرچی بڕیاری خوا بێتەوە، با بزانین کە خوای گەورە ( الله ) خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە ، ئەوەی ویستی بێ دروستی دەکات و خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا شارەزا و بە توانایە .

بەرباران براون لە بارەی ناردنی عیسای پێغەمبەر ( علیه السلام ) لە لایەن خواوە بۆ جولەکە ( بەنوئیسرائیل ) دەڵێ: عیسا کە تەمەنی نزیکەی سی ساڵی بووە، عیسا بۆ جولەکە روونی کردۆتەوە کە پەیامەکەی ئەو لەلایەن خواوەیە و بۆ جولەکە هاتووە تاوەکو بگەڕێنەوە سەر رێگەی راست ( إن إبن الإنسان قد جاء ليستنقذ ذلك الذي ضاع ) [1]

واتا کوڕی مرۆڤ * بۆ ئەوە هاتووە ئەو پەیامە زیندوو بکاتەوە کە لە دەست چوو بوو . لە بانگەوازی پێغەمبەرایەتیدا بەردەوام بوو تا وەکو جولەکەی ژێر باری رۆمان و دەسەڵاتدارە بت پەرستەکانی رۆمان لە دژیدا کۆبوونەوە بۆ کوشتنی و کەسێکی دیکەیان لە جێگەکەیدا کوشت ( لە خاچدا )، پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێت : ((وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ، بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا )) [2]

---

[1] براون ، بربار : نظرة عن قرب في المسيحية ، لا ١٧ ، إنجيل متى : ١٨ ١١

* کوڕی مرۆڤ ئاماژەیە بۆ عیسا ( علیه السلام ) ، چونکە لەو رێگەیەوە لە دایك نەبووە وەکو ئەوەی مرۆڤ لە دایك و باوکێکەوە بێن ولەو دەقەی ئینجیلدا بە کوڕی مرۆڤ هاتووە ، بەڵام لە قورئاندا زۆر راشکاوانە رێز لە خۆی و دایکی گیراوە و بە عیسای کوڕی مەریەم ناوی هاتووە . نوسەر .

[2] سورەتی : النساء ، ئایەتی ١٥٧ – ١٥٨

واتـا : ئـەو قـسـەیەیان کـە دەڵێـت مەسـیح،عیـسای کـوڕی مەریـەم پێغەمبـەری خوامان کوشـتووە راسـت نیـە، نـە عیـسایان کوشتووە و نـە لە خاچیان داوە، بەڵکو کەسێکی تر چووەتەوە شێوەی عیسا و لەوان تێکچووە ، ئەوانەش کە لە بارەیەوە جیاوازن لە بارەیەوە لە گوماندان و جگە لـە گومان زانیاریـان لـە بارەیـەوە نیـە و بـە راسـتی نەیانکوشـتووە، خـوای گـەورە بەرزیکردۆتەوە بۆ ئاسمان و بۆ لای خۆی و خواش بە دەسەڵاتە و سەرخەری ئەو کەسەیە کە ویستی سەرخستن وپاراستنی بۆ هەیە

نەسـرانیەکان لـە بـارەی مەسـیحەوە جیـاوازن، هەنـدێکیان وەهـا باوەڕێکیان هەیە کە لە پێناو هەڵەی مرۆڤەکانـدا لـە خـاچدرابێ، ئـەوەش بۆ خۆی داهێنانێکی سەیری گاورەکانە ا بەشێکی دیکەشیان لە چاوەڕوانی ئەوەدان بگەڕێتەوە سەر زەوی بۆ سەرخستنی پەیامەکەی .

بـە هـەر حـاڵ ئـەوکات جولەکـە باوەڕیـان بـە بانگەوازەکـەی نـەکرد و پێغەمبەرایەتیەکەیان بە فرۆفێڵ دەزانی، ئەوەش لە لایـەن ( أحبار ) زاناکانی جولەکەوە سەرچاوەی گرتبوو، تانـەی داوێـن پیـسیان خـستە پاڵ مەریـەمی دایکـی ( علیهـا الـسلام ) و باوەڕیـان وەهـا بـوو کـە لـە دایـك بـوونی عیسا لـە رێگـەی نـا شـەرعیەوە بـووە، بانگەشـە و قـسە گـەلێکی پـوچ بـوون و لـە خوڕەوشتی جولەکەکان دەوەشایەوە .

شارل جنیبیر دەڵێ : لە ماوەیەکی زۆری هەوڵدانیدا بۆ قایلکردنیان، لـە بانگەوازەکـەیدا سـەرکەوتوو نـەبوو، خـەڵکی فەلەسـتین ئـەو پەیامـەیان بـە راست نەخستەوە کە بە گوێیدا دەدات و ئەو بەرنامە ئەخلاقیـەیان وەرنەگرت کە خوای گەورە بە نیگا ( وحی ) بە پێغەمبەرەکەیدا [٢]

---

[٢] جینبیر : شارل المسیحیة نشاتها و تطورها ، ترجمه الامام الاکبر محمود شاکر ، لا ٤٢

مەسیح لای جولەکە بە منداڵێکی نا شەرعی بۆی روێندراوە، لای موسڵمانانیش عیسا مرۆڤێکە و یەکێکە لە پێغەمبەرە هەڵبـژێردراوەکانی خوا، بەڵام لای مەسیحیەکان عیسا زۆر لەوە زیاترە [4] ، [*]

مەسیح بە راشـکاوانە راستەقینەی تـاڵی بە گـوێی جولەکەکانـدا دا کـە رووبەڕوویان بوویەوە بەوەی زۆردرا و رەق و لادەر و فڕوفێڵباز و ریابازن و بە چاکە خـواز و کەسـی چاك خۆپیـشان دەدەن و لـە ناخیـشەوە فێـڵ و خراپەکاریان حەشارداوە، قسە گەلێك دەردەخەن لە ویژدانیانـدا نیە و بە زمان شتێك دەڵێن لە دڵیاندا نیە [6]، وەکو ئینجیلی مەتا دەڵێ : لە نێو بچن ، ئێوە لە کۆمەڵە گۆڕێك ئەچن، لە دەرەوەدا جوان دەردەکەوێت و لە ناویشدا پڕ بە ئێسك و پروسکی مردوان و هەموو پیسن، بەوجۆرە ئێوە لە دەرەوەدا بۆ خەڵکی خۆتان باش دەردەخەن، بەڵام لە ناوەوەدا پڕ بە تاوان و ریا بازین .

ئەم وەسفەی مەسیح بۆیان زۆر جوانە، خووڕەوشتی رابردوویان و بەردەوام بۆ ئێستایانە، لەم سەردەمەشدا پیشەیەکی کار لەسەر کراوە بۆیان، زۆرێك رێکخراوی ئەم سەردەمە کە جۆرەها ناویان لە خۆ ناوە دروستکراوی دەسـتی ئـەوانن، کاریـان لێکۆڵینـەوەی کاروبـاری توێژەکانـە و پلانـی رایەڵەکردنی زاڵبوونی فیکری و سەربازییانە بۆ سەر جیهان و خاڵی لاوازی کۆمەڵگەکان لێکۆڵینەوە دەکەن، بەوەش لە کۆنەوە تاوەکو ئێستا ئەزمونێکی زۆریان لە وەها پیشەیەك دۆزیوەتەوە .

قورئـان زۆرێـك رێـزی لـەو پێغەمبـەرە گەورەیـەی خـوا نـاوە، موسڵمانان بە درێژایی هەزار و چوار سەد ساڵە دوو دڵیان نەکردووە لە بە بەرنامەکردنی ئەو بەرنامە پیرۆزە لە رێز دانان بۆ عیسا ( علیه السلام ) [1]

---

[4] براون ، بربار : نظرة عن قرب في المسيحية ، ل ١٥

[*] بۆ باس کردن لەو باوەڕە خوا لە میانەی ئەم بەشەدا قسەی لەسەر دەکرێت . نوسەر .

[6] الشرباصي ، د . احمد : يسالونك في الدين والحياة ، ج ٧ ، ٤٢٢

[1] جينيبر شارل : المسيحية نشأتها و تطورها ، ترجمة الامام الاكبر محمود شاكر ، ل ٤٢

قورئانی پیرۆز لەو هەموو لادانەی شوێنکەوتەکانی دواتر، عیسا ( علیه السلام ) پاك رادەگرێت، لەو هەڵەیەی کە جولەکە وەکو چەکێك بەکاریان هێنا بەوەی عیسا لە پەیامەکەیدا داوای خوایەتی کردووە شوێنکەوتە گومڕاکانی بانگەشەی پوچەڵی دەکەن بەوەی عیسا خوایە، یان بەشێکی خوایەتی تێدایە . لە باوەڕیاندا ئەوە چەسپیووە کە عیسا ( علیه السلام ) خۆی فرمانی ئەوەی پێ کردوون و خۆی بە خوا ناساندووە . وەها قسەیەك لە هیچ پێغەمبەرێکەوە نەوتراوە، درۆ لەسەر خوا کردنە و بێ باوەڕی کردنە، ئەوە تەنیا لای مەسیحیەکانە کە عیسا بە خوا زانراوە [٢]

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بێ تاوانی عیسای مەسیح لەو قسەیەی جولەکە و گاورەکان ئاشکرا دەکات و دەفەرموێت : (( يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ وَلاَ تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقِّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلاَ تَقُولُواْ ثَلاَثَةٌ انتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْ إِنَّمَا اللّهُ إِلَـهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَن يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَات وَمَا فِي الأَرْضِ وَكَفَى بِاللّهِ وَكِيلاً )) [٣]

لە نامەی بوترسدا هاتووە : سەلاو لە سەلمانی بوترسەوە، بەندە و رۆحی مەسیح بۆ ئەو کەسانەی هاوبەشمانن لە تاکە باوەڕی بە نرخ، کە هەموومان بە چاکەی خواوەند و رزگارمان یەسوعی مەسیح لەوە دەست خستنیدا یەکسانین [٤]

ئەوەش یەکێکە لە هەرە گەورەترین ستەم و هاوەڵ پەیداکردنی گاوردکان کە قسە دەکەن لەوەی مەسیح خوایە، هەروەها لە یەکێك لەو نامیلکانەی بە کوردی لە کوردستاندا بلاویان کردۆتەوە بە مەبەستی بلاوکردنەوەی تەبشیریان کە نامیلکەی (( رێگای بەرەو خودا )) یە و لە رووپەری بەرگەکەیدا وەها دەزانرێ مەبەست لە خوجا ئەو خوایەیە کە پەیامەکانی دابەزاندووە وئاسمان و زەوی دروست کردووە و مرۆڤ

---

[٢] براون ، بريار : نضرة عن قرب في المسيحية ، لا ١٥ – ١٦

[٣] سورەتی :النساء ، ئایەتی ١٧١

[٤] الانجيل ، كتاب الحياة ، لا ٧٠٨

بوونـەوەرانی خولقانـدووە، کەچـی لـە نـاوەوەدا پێناسـی ئـەو خوایـە تەمومژاویـە، داواکـراوە بـاوەڕ بـە عیسـای مەسـیح بهێنـرێ، باوەڕهێنـانی داواکـراو لێـرەدا داواکردنـی بـاوەڕبوون بـە پێغەمبەرایـەتی نیـە، بـەڵکو باوەڕهێنانە بە خواوەندێتی عیسا، هەروەکو دەڵێ : گەر بە دەم دانت پێانا عیسا خواوەندە، هەروەها لە دڵەوە باوەڕت هێنا خودا لەناو مردوان زیندووی کردووەتەوە، ئەوسا رزگارت دەبێ [*]

عەقڵی تەواو باوەڕ بە وەها باسێك ناچەسپێنێ کە بانگەشەیەکی لەو جۆرە داواکاریەکی ئاینی ئاسمانی نەشێوێندراوبێ، بۆیە لادانێکی گەورە لە بناغـەی ئـەو ئاینـەدا دەبیـنین کـە ئـەویش یەکتاپەرستیە، بـاوەڕی ئـەوان بـاوەڕێکی بـت پەرسـتی رۆمانەکانـە و هـیچ پەیوەندییـەکی بـە ئـاینی ئاسمانیەوە نەماوە لەو بوارەی کە یەکتادانانی خوای تیادا مەبەستە .

ئـەوان جیـاوازی نێـوان پێغەمبـەران دەکـەن ، کـە موسـا لـە هـەموو ماڵـەکانی خـوادا ئـەمین بـووە، بـەڵام بـەو پێیـەی خزمـەتکار بـووە، ئـەوەش شایەتیەکە لەوەی دواتر خوا رایگەیاندووە، بەڵام مەسیح ئەمین بووە بەو پێ یەی کوڕی خوا بووە و خاوەنی ئەو ماڵە بووە کە ئێمەی ئیماندارانین، بەوەی تا کۆتایی پابەند بین بە متمانە و شانازیکار بین بە ئومێدەکانمان [1]

بـاوەڕ بـوون بـە مەسـیح لـە نێـوان کاردانـەوەدا ئـەنجام دراوە و بـۆی تەماشا کراوە، عیسا ( علیـه السلام ) لای جولەکە ( پەنا بە خوا ) بە کوڕی داوێن پیس تەماشا کراوە، ئەم کارە کاردانەوەیەکی لای گاورەکان دروست کردووە و بە وەرگرتنی باوەڕی رۆمانیەکان عیسایان کردووە بە خوا و کوڕی خوا و رۆحی خوا،

لای موسڵمانەکانیش موسا و عیسا ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) دوان لـە پێغەمبـەرە ئولولعەزمـەکانی خـوان و جیاوازیـان لـە نێوانـدا نیـە و هەردووکیشیان بانگەوازیان کردووە بۆ یەکتاپەرستی و باوەڕهێنانی مرۆڤ بەخوا، بەو جۆرەی پێغەمبەران گەیاندوویانە ، نەك بەو جۆرەی بێتە مایەی دەمارگیری و فروفێڵکاری .

---

[*] رۆما ١٠ : ٩ رێگەی بەرەو خوا

[1] الانجيل ، كتاب الحياة ، لا ٦٥١ ، المسيح اعظم من موسى ( عيسا لە موسا گەورەترە ) .

ئینجیل :

لەم بەشەدا باس لە ئینجیل دەکەین، کە پەیامێکی ئاسمانی بووە بۆ عیسای مەسیح ( علیه السلام ) بۆ بانگەوازکردنی جولەکە بۆ یەکتاپەرستی و پـاکراگرتنی دەرونـەکان لـە فرِوفێـڵ و خراپـەکاری کـە لـە هـەموو سەردەمەکاندا مرۆڤەکان گیرۆدەی دەبن، بەتایبەت لە کۆمەڵگایەکی نمونەی جولەکەکان بەوەی لە پێناو بژێوی دونیادا گەیشتنە ئەو ژیانەی کە هەر لەم دونیایەدا دەبێ بوونی هەبێ، لە باوەڕی ئەواندا پێویستە دەروونەکان زۆر خراپەکارانە لە ژیان بروانن .

خوای گەورە ئینجیلی بۆ ئەو پێغەمبەرە نارد ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) تاوەکو بەرنامەی ژیان وبێ لایەنی ئامۆژگاری و رێنیشاندەری لە خۆ گرتووە پەروەردگار دەفەرموێت (( وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُواْ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيهِم مِّن رَّبِّهِمْ لأكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَاء مَا يَعْمَلُونَ )) [٢]

واتا: گەر جولەکە و گاورەکان بە راستی کاریان بە تەورات و ئینجیل و ئەم قورئانە دەکرد کە لە لایەن خواوە بۆیان هاتووە، ئەوا لە زەوی و ئاسمانەوە بەرەکەتیان بەسەردا دەباری، تیایاندایە کەسانی ژیر و نەرمن، زۆرێکیشیان نالەبار و کاروکردەوە خراپن . هەروەها دەفەرموێت : (( وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعَيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ )) [٣]

واتا: بە دوای پێغەمبەرەکانی بەنوئیسرائیلدا عیسای کوڕی مەریەممان نارد بەوەی پێغەمبەر و باوەڕی بە تەوراتی پێش خۆی هەبوو، ئینجیلیشمان بۆ نارد کە روونـاکی و هیدایـەتی تیـادا بـوو، پـەیامی تەوراتیـشی بەڕاست خستەوە و بۆ لە خوا ترسانیش ئامۆژگاری وپەند بوو .

---

[٢] سورەتی : المائدة ، ئایەتی ٦٦

[٣] سورەتی : المائدة ، ئایەتی ٤٦.

بەم جۆرە و بە تێپەڕ بوونی کات لای پیاوانی کڵێسا ئینجیل بوو بە چەند ئینجیلێـک، گەرچـی لای گاورەکـان خۆیانـەوە سـەلماوە کـە عیـسا لـە قوتابیەکانی داوای کردووە ئینجیلەکەی بنووسنەوە، ئینجیل لە فەلەستیندا بۆ مەسیح دابەزی، بۆلسی قەشە نە شارەزا بوولە سروشت و مەنتیقی ئەو ئاینە و خۆیـشی لە بانگـەوازی ئەو ئاینـەدا بـوو بـە کەسـی یەکـەم لـە دوای عیسا، کەسێکی نـە شـارەزا و لـە هـەمان کاتـدا دەم سـپی دەبـێ لـە وەهـا کەسێکدا چ پەیامێك بنەخشێنرێت !

ئـەڵێن ئینجیـل وشـەیەکی یۆنانیـە و واتـای موژدەیـە، واتـا هـەواڵی خۆش، چوار ئینجیلەکەش بـریتین لـە : ( مەتا و مورقس و لۆقا و یۆحەنا) موژدەکانی مەسیحیش قسە و کردارەکانێتی ، گێڕانەوەی کتێبەکانیش ( ئینجیلەکان ) بە جیاوازی نووسین ورێکخستنی نوسەرەکەیەوە جیاوازە [1].

لە پاڵ ئەو چوار ئینجیلەدا ئینجیلی دیکەش هەیە، لەوانە ئینجیلی بەرنابا کە گاورەکان رقیان لێ دەبێتەوە و لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین .

دانـدەنێن بـە ئینجیلـەکان و جیـاوازی گێڕانـەوەکان، جیاوازیـەکان ئەوەنـدە شەرمەزاریانەیە بە خوێندنەوەیان ویژدان ئازار دەبینێ، هـەر نوسـەرێك و بە ئاوازێك دایڕێژاوە و هەستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر ئەو خوایەی مەسیحی خولقاندووە نابینرێت .

فردریـك یـودل لـە کتێبەکەیـدا ( تـاریخ علـم الاخـلاق ) دەڵـێ: ئـەوەی پەیوەندی بە ژیـانی زانسـتی یـەوە هەیـە ئەوەیـە دەبینین، کە زانیارییەکانی مەسیحیەکانی سەرەتا هەروەکو ئینجیل دەریبڕیووە جیاوازە لەو زانیاریانەی کڵێسا کە دواتر لاهویەتی بۆڵسی هێنایە ئاراوە [2]

---

[1] العهد الجديد ، جدول الشروح ، لا ٧١٢

[2] بيجوليتش ، علي عزت ، الاسلام بين الشرق والغرب ، لا ٣٥٣

هەروەکو بیست و دوو زانای لاهوت لە جیهانی سێ دا و لە دوای کۆبوونەوەیان لە ( دار السلام ) لە مانگی ئابی ١٩٧٦ بەیانێکیان دەرکرد و تیایدا هاتووە : مەسیحیەت لە ئاسیا لە دایک بوو ، لە ئەفریقاش بڵاو بوویەوە پێش ئەوەی لە ئەوروپادا ناوبانگی پەیدا بکات[٣]

گراهام سکروجی ئەندامی مودی کتێبی پیرۆز و لە گەورە زانا پرۆتستانتە تەبشیریەکان لە کتێبەکەیدا ( هل الکتاب المقدس کلام الرب ) دەڵێ : کتێبێك دروست کراوی مرۆڤ ، بەڵام ئاسمانی، دەڵێ : بەڵێ کتێبی پیرۆز لە دروست کراوی مرۆڤە، گەرچی هەندێ بە نەزانی ئەوە بەرپەرچ دەدەنەوە، ئەو کتێبانە بە بیری مرۆڤدا تێپەڕبوون و بە زمان و پێنوسی مرۆڤ نووسراون، هەروەکو هەڵگری سیفەت گەلێکە کە لە شێوازی زمان و نوسینی مرۆڤن و سروشتی مرۆڤانەیە [٤]
بەریارا براون ئەڵێ : لە ڕێگەی خوێندنەوەوە بۆ ئەو ئینجیلانە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەوەی کە پێی دەوترێت کتێبی پیرۆز، ئێستا نوسینی چەند کەسانێکی ئاسایین زیاتر لەوەی نیگا ( وحی ) بێت [٥]

لێکۆڵینەوەی تەواو و چڕی نامەکان پەردە لادەدەن لەبەردەم تێکەڵەیەکی سەیری بیرو باوەڕەکان، تێکەڵەی بیری جولەکە کە دەقە کۆنەکانە و هەروەها چەمکە بەربڵاوەکانی بت پەرستی یۆنان و یادەوەری ئینجیل و ئەفسانەی ئاینی ڕۆژهەڵات [٦]

---

[٣] في سبيل حوار الحضارات : روجية غارودي ، ترجمة : د. عادل العوا ، ل ٣١ ، بيروت .

[٤] احمد ديدات : هل الكتاب المقدس كلام الله ؟ ترجمة : نورة احمد النومان ، ل ١٤

[٥] براون ، بەریار : نظرة عن قرب في المسيحية ، ل ٧٢ .

[٦] شارل جينيبير: المسيحية نشأتها و تطورها ، ل ٧٠

بۆیە ئەمڕۆ دەرك دەكەین كە لایەنی ڕەسەنی مەسیحیەت لە ڕۆژهەلاّتدایە و مەسیحیەت لە ئەورووپا دوانەیی ( ثنائیة ) یۆنانی ویّرانی كرد و ئەو مەسیحیەتە دامەزراوەییەی كە شیّوەی ئاینی مەسیحیەتی لەسەردەمی قوستەنیتی ئەمپراتۆر و تاوەكو ئەمڕۆ دیاری كرد، ئەوە بیری گریك و ڕیّكخستنی ڕۆمانی سەرچاوەكەی نالەبار كرد [٦]

هەر كەس ئینجیلەكان بخویّنیّتەوە و ژیری بكاتە سەنگی مەحەك، ئەوە شت گەلیّكی سەیری بەرچاو دەكەویّ ، باسی دژ و دروست كراو و هەلّبەستراو، وەهاش دانراوە كە فەرمایشتی عیسای پیّغەمبەر بن ( علیه السلام ) .

لە لۆقادا هاتووە : ( هەركەس لە بەردەم خەلّكیدا دانم پیّدابنیّ و باوەڕم پیّ بهیّنیّ، ئەوا لەبەردەم باوكمدا باوەڕی پیّ دەهیّنم كە لە ئاسمانەكاندایە، هەركەسیّكیش لەبەردەم خەلّكیدا ڕەتم بكاتەوە و باوەڕم پیّ نەهیّنیّ، ئەوا لەبەردەم باوكمدا كە لە ئاسمانەكاندایە ڕەتی دەكەمەوە ) یاخود لەسەر زمانی عیسا هیّناویانەتەوە گوایە فەرموویەتی: (( وەها گومان نەبەن كە وا ئاشتیم بۆ جیهان هیّنابیّ، نەخیّر من بۆ هیّنانی ئاشتی نەهاتووم و ئاشتیم هەلّنەگرتووە، بەلّكو شمشیّرم هەلّگرتووە، هاتووم تاوەكو باوك و كوڕ لەیەك بكەم، دایك و كچ لیّك دوور بخەمەوە، تاوەكو دوژمنی مرۆڤ لە نیّو خیّزانەكەی خۆیدا بیّ )) [١]

پیّغەمبەران پەیامەكەیان بریتی بووە لە یەكتاپەرستی و بەرپاكردنی عەدالەت خوازی، ئەوەی سەرەتا كە باس لە كوڕیّتی بوونی عیسا بوو بۆ خوا لە ئەفسانە یۆنانیەكان دەچیّ، دوژمنكاری خستنەوەی نیّو خیّزانەكانیش لە كاری شەیتانە نەك پیّغەمبەران ( سەلامی خوایان لەسەر بیّ )، بۆیە لەوەها دارشتنەوەیەكدا لیّزانانە گەیاندوونی بە بیر و باوەڕە كۆنەكانی یۆنان و مەجوسیەت و پاشان لە قالّبدانیّكی باشی بۆ ڕیّكخستوون !

---

[٦] في سبيل حوار الحضارات : روجية غارودي ، ترجمة : د . عادل العوا ، پەراویّزی لا ٣١

[١] العهد الجديد ، لا ٢٩ ، انجيل لوقا ١٢ ٨ – ٩

## ئینجیل و گێڕانەوەی موعجیزەی مەسیح

ئینجیلی یۆحنا دەگێڕێتەوە کە لە زەماوەندێکدا لە شاری قانای جەلیل ، مەسیح و دایکی و خوێندکارەکانی لەوێدا دەبن و دەعوەتی زەماوەندەکە دەبن و عەرەق نامێنێت تاوەکو بەشی خەڵکەکە بکات، دایکی یەسوع بە یەسوع ( مەسیح ) دەڵێ : عەرەق ( خمر ) نەماوە مەسیحیش فەرمان دەکات کە شەش کوپی گەورە پڕ لە عەرەق دەبێ [1] ، ئەوەش بە سەرەتای ئەو بەڵگانە دەزانرێ کە یەسوع ( مەسیح ).لە قانای جەلیلدا ئەنجامی داوە و بەوەش شکۆی دەرکەوتووە و خوێندکارەکانی باوەڕیان پێی زیاد بووە !، ئاخۆ کارێکی لەو جۆرە بەڵگەی موعجیزە بوونە !، ئێمە دەزانین عەرەق چی بارێك بۆ مرۆڤ دروست دەکات و ئاین بە هەر جۆرێك دژ بە وەها خوڕەوشتێکە و پێغەمبەران دژی وەستاونەتەوە، کەواتە دەبێ کاری پێغەمبەران لە چی بارێکدا بووبێ کە خۆی لە وەها کارێك بدات ؟ !

گەر عیسا ( علیه السلام ) ئەو کارە و نمونەکانی بەدی بهێنایە بۆچی هەوڵی کوشتنی دەدرا ؟ ! وە دەکرێ زیری مرۆڤ لە چی پلەیەکدا بێ بەوەها کارێك بڵێ موعجیزە و بەوەها پەرتوکێك بڵێ ئاسمانی !

---

[1] انجیل یۆحنا : ٢ : ١ ، ٢

هـەر لـە ئینجیلـی یۆحنـا ٢ ٢٣ – ٢٤ باسێك هەیـە و ئەمـەش کورتەکەیەتی: کە لە ( عیدالفصح ) مەسیح لـە ئەورشەلیم بووە و خـەڵکێکی زۆر باوەڕیـان پـێ هێنـاوە بەرامبـەر ئـەو موعجیزە و بەڵگانـەی خستبویە بەرچاویان، مەسیح بەرامبەر ئەو باوەڕهێنانە بێ منەت بووە، چونکە ئەوانەی ناسیوە و پێویستی نـەبووە کـەس لـە بارەی مرۆڤـەوە گـەواهی بدات، چونکە زانیوێتی چی لە مرۆڤدا هەیە !، بۆیە جێ ی خۆیەتی بپرسین ئاخۆ کە باش مرۆڤی ناسیوە و وەها بڕیارێکی پێش وەخت هەبوو بێ، دەکرێ چ سوودێك لە وەها بەڵگەیەکدا هەبێ بۆ خستنە پێش چاوی خـەڵکێك کە ئامانج تیایدا ڕێنیشاندەری و دەست هـەڵگرتن بێ لە تاوانکاری ؟ ! یان گـەر پێغەمبـەرێك منـەتی بە خـەڵك نـەبێ، بۆچـی ئەوەنـدە دژایـەتی دەکرێ، ئـاخۆ بـە شـوێن بـاوەڕی ئەوانـدا نـەبووە، ئەوەنـدە کۆششی کـردووە و توشـی ئـازار بـووە ؟ !ئـاخۆ ئـەوە بـیر و باوەڕیـان بێـت، بـەهای ئـاینێکی ئاسمـانی لـەم جـۆرە لـە کوێدایە، لە کاتێکدا دەزانین ئامانجی پێغەمبەران بانگەوازکردنی مرۆڤایـەتی بووە بۆ تاك پەرستنی پەروەردگار و خو ڕەوشتی جوان و دوور کەوتنـەوە لـە هـاوەڵ پەیـداکردن و خراپـەکاری و بڵاوکردنـەوەی خۆشەویـستی و ڕێـز و پاکی، تاوەکو ژیان پڕ بێ لە بەختەوەری وکۆمەڵگە ژیانێکی ڕێزدارانە بکەن .

سەرسوڕمانیە گاورەکان لـە دروستکردنی وەها باوەڕێکدا بوێریان نواندووە، باوەڕەکەشیان بۆ لای عیسا ( علیه السلام ) پاڵ داوە، بۆیـە لـەوەدا سەیر نیە کە داڕێژانی ئەو باوەڕانە ئامانج تیایدا دروستکردنی ئەو ژیانە بێ کە پڕ بە ستەم و جەنگ و لە خشتە بردن بێ لە پێناو گەیشتنە بەرژەوەندییە خراپەکاریەکان، کـە لـە سـەر باوەڕێکی زەمینانـە دەوەسـتێتەوە نـەك لەسـەر ئاینێکی لەو جۆرەی عیسا بۆی بانگەوازی کردووە

نەسرانیەت ( النصرانیة ) :

لە قورئانی پیرۆزدا باس لەو کەلە کۆمەکیە کراوە کە جولەکە و بت پەرستان لە دژی عیسای مەسیحدا ( علیە السلام ) ئەنجامیان داوە بە مەبەستی کوشتنی و کپ کردنەوەی بانگەوازەکەی. مەسیح لە خوێندکارەکانی پرسیووە کە کێ دەبێتە پشتیوانی ئاینی و خوێندکارەکانیش دووپاتی پشتیوانیان بۆ عیسا و پەروەردگارەکەیان کردۆتەوە، پەروەرگار دەفەرموویێت : ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا أَنصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ فَآمَنَت طَّائِفَةٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَت طَّائِفَةٌ فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ )) [1]

واتا : عیسا فەرمووی کێ لەبەر خاتری خوا سەرم دەخات و دەبێتە پشتیوان، حەواریەکان ( خوێندکارەکانی عیسا) ( علیە السلام ) وتیان : ئێمە دەبینە پشتیوانی خوا و پێغەمبەری خوا و ئەی پێغەمبەری خوا شایەت بە کە باوەڕدارین بە خوا . بۆیە دەوترێت کە نەسرانیەت لە وشەی ( ناصر، نصر ) واتا سەرخستن و پشتیوانان وەرگیراوە .

هەروەها دەفەرموویێت : (( فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ )) [2]

دەشوترێت کە سەرچاوەی وشەی نەسرانیەت بۆ شاری ( الناصرە ) ەی فەلەستین دەگەڕێتەوە کە مەسیح ( علیە السلام ) تیایدا لە دایك بووە .

لەوەدا نەسرانیەت دەبێتە ئەو ئاینەی کە بەسەر عیسا ( علیە السلام ) دابەزی بۆ گەڕانەوەی بەنی ئیسرائیل و تەواوکردنی تەورات، بە مەبەستی ئاراستە کردنی بەنو ئیسرائیل بۆ یەکتا پەرستی و دەست هەڵگرتن لە دونیا [3]

---

[1] سورەتی : الصف ، ئایەتی :١٤

[2] سورەتی : آل عمران ، ئایەتی :٥٢

ئاینەکە هەر نەسرانیەتی پێ وتراوە و دواتر پێی وتراوە مەسیحیەت و بە شوێنکەوتووانی وتراوە مەسیحی، وەکو پاڵدانەوەیەك بۆ شوێنکەوتن و لایەنگیر بوون بە عیسای مەسیح ( علیه السلام )

شارل جینبیر دەڵێ : مەسیحیەت لە بنچینەدا بزووتنەوەیەکی یەهودیەتە و تایبەت بە ژیانی ئاینیانەی جولەکە بووە و تایبەت بە ژینگەی فەلەستین بووە و ئاشکرێ لە دەرەوەی جیهانی جولەکە بوایە [٤]

بێگومان نەسرانیەت ئاینێکی جولەکە بووە و ئاماژەیەکی روونیش هەیە بەوەی بانگەوازی مەسیح تەنیا گەلی جولەکە بووە

لە ئینجیلی مەتا هاتووە : کوڕێکت لە دایك دەبێ تۆش ناوی لێ دەنێی یەسوع ، چونکە ئەوە گەلەکەی لە هەڵەکانیان رزگار دەکات [٥] گەلەکەی لە هەڵە و تاوانەکانیان رزگار دەکات تەنیا ئاماژەیەبۆ گەلی جولەکە.

یان یەسوع لە ( بیت لحم ) لە دایك بووە لە رۆژگاری هیرۆدۆسی پادشادا کۆمەڵێك مەجوسی لە رۆژهەڵاتدا هاتن بۆ ئورشەلیم و دەیانپرسی پادشای لە دایك بووی جولەکە لە کوێ یە ؟ [٦]

هەروەها لە ئینجیلی مەتا { ٢ : ٦ } هاتووە کە خوا بە بەیتە لەحمی جولەکەی وتووە : ئەی بەیتە لەحمی زەوی یەهوزا تۆ بچووك نیت، چونکە لە تۆ ئەو پێغەمبەرە دێت کە گەلەکەم، ئیسرائیل بەڕێوە دەبات .

---

[٣] الموسوعة الميسرة للأديان و المذهب المعاصرة ، لا ٤٤٩

[٤] بروانە : المسيحية نشأتها و تطورها ، ترجمة الإمام محمود شاكر

[٥] إنجيل متى : ( ١ ٢١ ) .

[٦] إنجيل متى : ( ٢ : ١ )

یان كە مەسیح ( علیە السلام ) خوێندكارەكانی دەنێرێ و ئەو ئامۆژگاریەیان بۆ دوپات دەكاتەوە و وریایان دەكاتەوە كە تێكەڵی نەتەوەكانی دیكە نەبن و تەنیا بانگەوازەكە لە گەلی جولەكەدا كورت بكەنەوە، هەروەكو لە هەندێ ئینجیلدا هاتووە : ئەو دوانزە كەسە یەسوع ناردیانی و ئامۆژگاریانی كردو وتی : مەچنە رێگای نەتەوەكان و نەچنە شاری سامیریەكانەوە، بەڵكو بچن ئیسرائیلی گومڕاوە

( دین إینج ) دەڵێ : عیسای پێغەمبەری جولەكە بووە لەسەردەمی خۆیدا و هیچ كات هەوڵی نەداوە لە پێغەمبەرانی دیكەدا لقێك بۆ خۆی بكاتەوە یان كڵێسایەكی تایبەت و جیاواز لە كڵێساكانی جولەكە دابمەزرێنێ [1]
لە ( دائرە المعارف البریگانیە ) شدا هاتووە كە حەواریەكانی مەسیح گرنگیان لەوەدا بووە مەسیحیەت ئاینی جولەكە بێ و مەسیحیش یەكێكە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل و بۆ بەنی ئیسرائیل هاتووە [2]

ئەوانە و زیاتر روانینە ئینجیلەكان، بەڵگەی روونە بەوەی بانگەوازی مەسیح ( علیە السلام ) بانگەوازكردنی جولەكە بوو بۆ ئاینی خوا و دەست هەڵگرتن لە كوشتن و تانەدانی پێغەمبەران و وازهێنان لە شیرك وخراپەكاری و یاریكردن بە پەیامەكانی خوا .

بۆڵس پێشتر جولەكە بووە و لە جولەكە بوونی هەڵگەڕاوەتەوە ......... ئەم بۆڵسی تەشەیە پەشێویەكی زۆری لە ئاینی عیسا ( علیە السلام ) دا دروست كردووە، تا ئەو ئاستەی پلەی دووەمی وەرگرتووە لە نێو ( پیاوانی زۆرتر كاریگەر لە مێژوودا ) [3]

---

[1] لە ئینتەرنێتەوە .
[2] لە ئینتەرنێتەوە .
[3] احمد دیدات : المسیح في الاسلام ، ترجمة : علي الجوهري ، لا ٥٨ .

چوونی بۆڵس بۆ نێو گاورێتی لە قودسدا نەبووە و ڕێگەکەشی بە گەیشتن بە دوانزە قوتابیەکەی مەسیح دروست نەبووە، نوسەری ئەڵمانی ( هایتمۆلر ) لە راستی لای نەداوە، کە لەبارەی بۆڵس و پەیوەندیەکەی بە عیساوە نوسیویێتی : بۆڵس لە ڕێگەی کۆمەڵگەی سەرتایی مەسیحیەوە بە عیسا کاریگەر نەبووە، بەڵکو لە ڕێگەی چەند زنجیرەیەکەوە بووە و بەم جۆرە بووە: عیسا، کۆمەڵگەی سەرەتایی مەسیحیەت،مەسیحیەتی هیلنستی ، بۆڵس [٤]
لەو ماوەیەدا کە بۆڵس هاتە نێو باسەوە زاراوەی مەسیحی یان مەسیحیەکانیش دروست بوون لە جیاتی زاراوە ڕەسەنەکەی، هەروەکو د.عمرفروخ دەڵێ : پێویستە جیاوازی نێوان نەسرانیەت و مەسیحیەت بکرێ، نەسرانیەت ئەو ئاینەیە کە بۆ عیسا( علیە السلام ) نێردراوە و ئاینێکی یەکتاپەرستانەیە، کە مەسیحی کوڕی مەریەم پێغەمبەرێکە، بەلأم مەسیحیەت کۆمەڵە بەرنامە و ئامۆژگاریەکە بۆڵس ساڵی ٦٧ ی زاینی دایناوە و لەسەر سیانەیی هیندی دروست بووە و پاڵدراوەتە لای مەسیح و بەخوا دانراوە [١]
کە گاورەکان لە پەرستگای جولەکە جیا بوونەوە توشی چەرمەسەری و ستەمی ئەمپراتۆریەتی ڕۆمان بوونەوە ، تا ساڵی ٣١١ ز جالیریۆسی ئەمپراتۆر مەرسومی نەرمونیانی بۆ مەسیحیەکان دەرکرد و کاتێکی زۆری نەبرد قوستەنینی ئەمپراتۆر هات و باوەڕی بە ئاینی نوێ هێنا، قوستەنتیش هەنگاوێکی مێژوویی و پێدانی دەسەڵاتێکی سیاسی بە کڵێسادا، هەروەکو د . کەمال مەزهەر لەباس لە پەخشی قوستەنتین.
( Donation of Constantia ) دەڵێ : کە بەڵگەنامەیەکی ساختەیی بووە لە سەدەی هەشتەمدا ڕاوێژکارانی پاپا نوسیویانەوە و وتیان گوایە قوستەنتینی ئەمپراتۆری ڕۆما لە سەرانسەری بەشی ڕۆژئاوا و تەنانەت ئیتالیاشدا دەسەڵاتی دونیا بە پاپا بەخشیووە، و پاپاکان ئەم بەڵگەنامە ساختەیەیان لە پێناوی دونیایی خۆیاندا وەکو چەکێك لە مەیدانی ململانێی سیاسیدا کردیانە بنچینەیەکی یاسایی و پشتیان پێ دەبەست [٢]

---

[٤] شارل جینبیر: المسیحیة نشاتها و تطورها ، لا ٨٧ .

[١] ا . د . علي بن إبراهیم الحمد النملة : التنصیر مفهومة و اهدافة و سبل مواجهته ، لا ٤١

[٢] د . کەمال مەزهەر : ڕێنیسانس ، و – فوئاد مەجید میسری ، پەراوێزی لا ٤٩ .

بـۆڵس لـە گەشـتێكیدا بـۆ دیمەشـق و بەمەبەسـتی دژایـەتیكردنی بانگەوازی نەسرانیەت، وەكو دەوتـرێ لـە خەویـدا عیسا داوای لـێ دەكات دەست لـە دوژمنایـەتی كردنـی هـەڵبگرێ و ببێتـە پـشتیوانی، ئـەویش لـە دژایەتی كردنی پاشگەز دەبێتەوە و كاری ئەو بانگەوازە دەگرێتە دەست، لە پلە و پایەی گـەورەی ئاینی ئەو لـە جولەكەییـدا و ناسراویەكەی و چەرمە سەری مەسیحیەكان، بۆ مەسیحیەكان پاڵپشتیەكی مەعنەوەی دروست دەبێ و لەوەشدا كاریگـەری زۆری بۆ دروست دەبـێ لـە بڕیارە ئاینیـەكانی بەسەر شوێنكەوتەكاندا، ئەو كارەی بۆڵس و جێ دەستی لە گۆڕانی هەیكەلی ئەو ئاینەدا ئەوە دەردەخات، كە پلانی جولەكەیی بووە دژ بە مەسیحیەتی ئاینی نوێ، هەروەكو هەندێ وەهای بۆ دەچن .

بـۆڵس لـە دارشـتنی ئینجیـل دا دەسـتی بـالای هـەبووە، هـەروەكو وتوویەتی : ئەو ئینجیلەی من موژدەی پێ دەدەم لە مرۆڤەوە نیە، وەرگرتن و فێربوونیم لە مرۆڤەوە نیە،بەڵكو عیسای لە خاچدراو نیگای بۆ كردووەم [٢]

بەم فڕوفێڵـە و سـادەیی خەڵكەكە كە لـە دەرەوەی ئاینی جولەكە نە شارەزا بوونە لە پەیامە ئاسمانیەكان، شێواوی رووی كردۆتە ئاینەكە،چونكە بـۆڵس ئـەوەی بـۆ خـۆی یەكلاكردۆتـەوە كـە لـە خۆیـەوە قـسە ناكـات و سەرچاوەی وتەكانی مەسیحن، هەروەكو لە نامەی ( ٤ ) بۆ خەڵكی ، ( كورنثـۆس ) دەڵـێ : بـا خـەڵكی وەكـو خزمـەتكارانی مەسـیح و وەكیلـی نهێنیەكانی خوا لـە ئێمە بڕوانن، لـە وەكیلـەكان پرسیار بكرێ تاوەكو مرۆڤ دڵنیا بێ، كەمترین توانایەكم هەیە لە بارەتانەوە بڕیار بدەم، بـەڵكو لـە خودی خۆشمدا هیچ بڕیارێك نادەم .

ئـەوەش پڕوپاگەنـدەی مەعـصومیەتە كـە لـە پلـەی پێغەمبەراندایـە و پێشتر ئینجیل لە لایەن خواوە بۆ عیسا ( علیـە الـسلام ) دابـەزێنراوە، كەچی ئەوەی لە خەوەكەی بۆڵسدا هاتبێ دووبارە دابەزێنەرەی ئینجیل بووە !

---

[٢] بڕوانە : شارل جنیبیر: المسیحیة نشاتها و تطورها

لە کاتێکدا بۆڵس نە عیسای دیوە و نە قوتابیەکانی کەچی ناوی بۆڵس لە دوای عیسا ( علیه السلام ) دووەمە و وەکو پەیامبەرێ لە مەسیحیەت تەماشا کراوە !

علی عیزەت بیجوفیتش لە کتێبەکەیدا ( الاسلام بین الشرق والغرب ) * لە بارەی بوونی یاسا لای گاورەکان دەڵێ : مەسیحیەکان یاسا وەکو هەوڵێکی خەیاڵی دەبینن بۆ چاککردن و ڕێکخستنی جیهان .... هەوڵێکە لە کۆتاییدا شکست بەشی دەبێ، بێگومان عیسا ( علیه السلام ) بۆ ئەوە هات خۆشەویستی بگەڕێنێتەوە و بۆ ئەوە نەهات لە پێناو ئەو دادگەریەدا بێ کە تەورات باسی کردووە، ئەو خۆشەویستیە هی ئەم جیهانە نیە .... بەڵکو گەورەییەکی ئاسمانیە و مەسیحیش بە پێویست بوون بۆ دادوەری دانی نەناوە [1]

بەهۆی ئەو تێکەڵیەش کە لە بیریاندا دروست بوو، بوونە بونەوەرێکی نوێ، بوونە شوێنکەوتەی ئاینێکی نوێ کە بناغەکەی بیری مرۆڤ بوو، ئەم ئاینە بۆ شوێنێکی سنوردار بوو کەچی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بانگەشەی جیهانێتی دەکرد و بۆ ئەو جیهانێتیەش جەنگی بەرپا دەکرد، بوویە ئاینێکی دەمارگیر سەخت و چارەسەری بۆ جیهانی دەرەوە پێ نەبوو [2] ، دەیانویست لە پاڵ ئەم ئاینە پاکەدا ژیانێکی زۆردارانە دروست بکەن، هەروەکو د . کەمال مەزهەر لە بارەی ڕێنیسانسەوە دەڵێ : کڵێسە و بیروباوەڕی ئاینی مەسیحیش سەرخانێکی گونجاو و لە بارەی بنکە ئابوریە دەرەبەگایەتیەکان پێك دەهێنا [3]

---

* الاسلام بین الشرق والغرب ، کتێبێکی علی عیزەتی سەرۆکی کۆچکردووی بۆسنەیە و کراوە بە کوردی لە ژێر ناوی ( ئسلام لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا و خوێندنەوەی بەسوودە - نوسەر .

[1] بیجوفیتش الاسلام بین الشرق والغرب ، لا ٢٣٢ ، ٢٥١

[2] شارل جینیبیر: المسیحیة نشاتها و تطورها . ، لا ١٨٩

[3] ڕێنیسانس ، نوسینی : د . کەمال مەزهەر ، و . فوئاد مەجید میسری ، لا ٨ .

هەر د   کەمال لەبارەی لەرزۆك بوونی ژیانی دەرەبەگانەی ئەورووپای ژێر دەسەڵاتی مەسیحیەت دەڵێ : لە دوای سەدەکانی ناوەڕاست، ئەورووپا دەرگای بۆ چەند لایەنێکی گرنگی کلتوری ڕۆژهەڵات خستە سەر گازی پشت و بەهۆیانەوە یاسا و نەریتێکی بۆ کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی هاتنە لەرزین، زۆربەی کلتوری ڕۆژهەڵاتیش کە لە بنەڕەتەوە ئیسلامی بوون لە ڕێگەی ئەندەلوس و سەقیلە و ئەو وڵاتە عەرەبانەی کە لە سەر ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستدا دەیانڕوانی گەیشتە ئەورووپا، لە ڕێگەی ئەندەلوسەوە بەرهەمی فەیلەسوفە کۆنەکان و لەسەرو هەموویانەوە ئەفلاتۆن و ئەرستۆ کە بە درێژای چەند سەدەیەك ون بوو بوون پەرپیەوە و گەیشتە دەست ئەورووپیەکان، هەرچەندە ئەو نوسینانە لە خەوش و ناتەواوی بەدەر نەبوون،بەلام لە روانگەی ئاین و شارستانیەتی ئیسلامیەوە هەندێ شتی نوێیان خرایەوە سەر، لە ڕێگەی (( سقیلە )) ە وە کە بە درێژایی دوو سەدە لە ژێر دسەڵاتی ئیسلامەکاندا بوو، زۆر بابەتی زانیاری وەك سروشتناسی و فەلسەفی و پزیشك گەیشتە ئەورووپا [1]

پەیامەکەی عیسا پەیامێکی ئاشتیانە و ئەخلاقی بوو، نەك پەیامێك زادەی بارودۆخی ئابوری و دەسەڵاتی سەردەم بووبێ، جولەکەکان خۆیان چارەڕێیان کردووەو زانیویانە عیسا بە یەهودی لە دایك دەبێ، بەلام سروشتی ملنەدان هۆکاری لە دژ وەستانەوەیانە بووە .

بەو جۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ بۆ ئەوەی زیاتر پابەندی ئاینی خوا بن، کەچی ئەم ئاینە لە ڕێگە ڕاستەقینەییەکەی لا دەدرا، ڕێگەی ئەو یەکتاپەرستیە بوو کە داننان بەوەی جگە لە ( الله ) هیچ خوایەکی دیکە نیە، کەچی لە بیری ئەواندا مەسیح دەبووە خوا و کوڕی خوا و ڕۆحی پیرۆز، بەوەش بیر و باوەڕی سیانەیی

( عقیدة التثلیث ) هاتە نێو گاورەیەتیەوە، خوای گەورەش باس لەو قسە بێ باوەڕیەیان دەکات و دەفەرمووێت :

---

[1] هەمان سەرچاوە ، لا ٢٢

(( وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ )) [٥]
واتا : جولەکەکان وتیان عوزێر کوڕی خوایە و گاورەکانیش وتیان مەسیح کوڕی خوایە، ئەوەش قسەیەکە و بە زار دەیکەن و قسەی بێ باوەڕانی پێش خۆیان دوبارە دەکەنەوە، بەر نەفرەتی خوا بکەون لەو قسەیەی کە دایان هێناوە .

ئەو بیر وباوەڕانە ژیری ساغ قبوڵی ناکات، تەنیا ئەو کەسانە نەبێ کە لە ژێر کاریگەری بیر وباوەڕە کۆنەکانی میسر و ئێران و یۆنانن، هەروەها لە ژێر کاریگەری ئەو ئاینانەن کە خواوەندی زۆریان لە خۆیاندا هەڵگرتووە

ئافرەتە موسڵمان بووی ئەمریکی سوزان حنیف لە بارەی ( عقیدة التثلیث )ەوە دەڵێ خوا وەکو هەویرێك نیە یان سێوێك وبکرێ بە سێ پارچەوە، ئەگەر خواش سێ کەس بێ سێ پارچە وبەشی ببێ، ئەوە بوونەوەری تاقانە نیە و ئەو تەواوە نیە کە شیاوی خوا بێ [١]

قوستەنیتی ئەمپراتۆر بۆ رزگار بوون لە پیاوە گەورەکان و پشت بەستن بە زۆرینە مەسیحی، مەسیحی بوونی خۆی راگەیاند، مەسیحیەکانیش سەرەڕای بەهێزبوونیان لە سەردەمی ئەودا نەیانتووانی بت پەرستی ببڕنەوە و لە ریشەی بهێنن، بەڵکو تێکەڵ بە بنەماکانی وەسەنیەت بوون، لە نوێوە ئاینێکی نوێ پێکەیشت و لە رواڵەتدا نەسرانیەت مایەوە لێرەدا ئیسلام جیاواز لە نەسرانیەت، چونکە ئیسلام بە تەواوی سەرکەوت لە نەهێشتنی بت پەرستیدا و بێ هیچ فڕوفێڵێك بیر و باوەڕی بلاو کردەوە [٢]

---

[٥] سورەتی : التوبە ، ئایەتی : ٣٠

[١] برلین ، بەربار : نظرة عن قرب في المسیحیة ، لا ٣٩ .

[٢] سید قطب : الاسلام و مشکلات الحضارة ، لا ٥٨

ئەوان لە وەها سەردەمێکی بەهێزیدا لە بیری تۆڵە کردنەوەدا بوون لە وانەی لە رابردوودا چەرمەسەریان پێ چەشتبوو، قوستەنتین فرمانی دەرکرد بە یاساغ کردنی نیشتەجێ بوونی جولەکەکان لە قودس و کوشتنی ئەو جولەکەیەی ئاینەکەی بە نەسرانی ( گاوری ) ناکات

ئەو بیرە ئاڵۆزانەی کە بەسەر کڵێسا و پیاوەکانیدا زاڵبوو، یارمەتیدەری زانا و پیاوانی زانست و رەخنەگرانی نەدا بۆ دۆزینەوەی شتێك سوودیان پێ بگەیەنێ، بەڵکو دۆزینەوەکان بۆ خاوەنەکانیان بوونە مایەی سەرئێشە و بەدبەختی ژیانیان، کڵێسا ئەوانی بێ باوەڕ راگەیاند، خوێن و ماڵیانی حەڵاڵ کرد و دادگای پشکنینی ( محاكم التفتيش) ی پێکەوەنا، سی و دوو هەزار کەسی بە زیندوویی سوتاند، لەوانە زانای سروشتناسی بەناوبانگ ( برۆنۆ ) بەهۆی ئەوەی قسەی لەسەر فرە جیهانی کرد بوو، هەروەکو گالیلۆش
( GALILION ) بە کوشتن پاداشت درا، چونکە باوەڕی بە سوڕانەوەی زەوی بوو بە دەوری خۆردا

مەسیحیەکان دەستیان گەیاندە شێواندنی سروشتی مرۆڤ، بەشێوەیەکی هەستیاری و وریایەوە دەیانڕوانیە شتەکان، بە تایبەت روانینیان بۆ بابەتی جینس و هاوسەرگیری، لەوەدا کاریگەر بوون بە تەقلیدە بتپەرستیەکان و ئەفریتی نوێ و رەواقی و فتوحی و عیرفانیەکان، گشت ئەو هێزانە سێکس ( جنس ) بە هێزێکی خراپەکاری دادەنێن، گۆشەگیری وخۆپارێزی لە سێکس گەورەییە و پێویستە پەیڕەوبکرێ، مەسیحیەتیش زۆر پێداگریانە ئەو بیرانەی تەبەننا کرد و بەو جۆرەش رەگەزی مرۆیی وخێزان کەوتە دۆخێکی ناسروشتیەوە، کە هیچ کات خوا فرمانی نەدا بوو [٢]

---

[٢] براون ، بەربار : نظرة عن قرب في المسيحية ، ل ٨٢ .

ئەو گۆڕانکاریانە لە کۆمەڵگەی گاوریدا هاتە دی، مەرجەعیەت لای ئینجیل نەما، بەوەی بوو بە قسە و بۆچوونی راهیبەکان، ئەوانەی سەرچاوەی بڕیار بوون لە کردن و نەکردنی بڕیارە ئاینیەکان بەبێ گەڕانەوە بۆ فرمانی خوا و پەیامبەرەکەی، خوای گەورەش لە وەسفی کۆمەڵگەی گاورنشین و نیەتی کارەکانیان دەفەرمووێت :

(( اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ )) [1]

واتا جولەکەکان، رەهبانەکان و، گاورەکانیش عیسای کوڕی مەریەمیان بە خوا زانیوە و وەکو خوا بۆیان دەڕوانن، لە کاتێکدا وەها فرمانیان دابوو کە یەك خوا بپەرستن، جگە لەو خوایە ( الله ) خوایەکی دیکە نیە و کەسی تر شیاوی پەرستن و خوایەتی نیە، پاك و بێگەردی بۆ خوا لەوەی هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن .

لە جیاتی خوا، راهیبەکانیان کردە سەرچاوەی بڕیار :تەنیا لەبەر ئەوەی پلەی ئاینیان بەرز و پشتیوانی بیر و باوەڕی سیاسی بوون ، مەسیحیەتیان دروست کرد وەکو بە دیلی نەسرانیەت کە عیسا(علیه السلام ) هێنای و لە سروشتی خۆیان دووریان خستەوە، چی لەمانە نەیکاتە سروشتی ئاینێکی ئاسمانی لە قسە کردن بەرامبەر پیغەمبەران بە ناشیرینی و خووڕەوشتی بت پەرستان و روتبازی، مەسیحیەت لەوەی بنەمای دەوڵەتی نەبوو، بە فیتی جولەکە بیرۆکەی سیکۆلار هاتە ئاراوە کە لە وڵاتانی ئێمەدا پێی دەوترێت عەلمانیەت و دەستی راهیب و قەشەکان لە بینە قاقای گەل کرایەوە، مەسیحیەت زۆر بە جوانی دوای ئەو بیرۆکەیە کەوت لە بەرامبەر پەرەسەندنەکان و دەرچوون لە کێشەی کۆمەڵایەتی و نەتوانینی ئەو لە گەڕاندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤایەتیەکەی .

---

[1] سورەتی : التوبە ، ئایەتی : ٣١

پیاوە ئاینیەکانی مەسیحیەت بوونە تاغوت و سیاسی فێڵباز و زۆردار لە ژێر پەردەی ئەلکرۆسن و رەهبانیەت و خوا پەرستی و چەکی غوفراندا * خۆیان حەشاردا، دژی زانست و بیری پێشکەوتوو وەستانەوەو دەستیان داوە تاوانبارکردنی زانایان، گرجردانر کە زانایەك بوو تیلسکۆبی دروست کرد دوور خرایەوە وسزای سەخت درا، لە ئەنجامی نالەباری و زۆرداری ئەواندا مارتن لۆسەر پرۆتنستانتی راگەیاند و هەریەکە لە کۆبرنیکۆس و دیکارت و بیکۆت و سپینوزا شۆڕشی بیریان راپەڕاند و دروستبوونی ئەو شۆڕشە بیریەش، ئەنجامی ململانێ ی نێوان کڵێسە و بزوتنەوەی نوێ بوو . ئەو ململانێیەش بوویە مایەی لە دایکبوونی حکومەتی سیکۆلاری فرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩ کە یەکەمین حکومەتی نا دینی بوو بە ناوی حکومەتی گەل .

---

* چەکی غوفران : چەکێکی لێخۆشبوون بوو بەرامبەر پێدانی پارە دەدرا بە خەڵکی بەو بیانووەی دەسەڵاتی پەیڕەوی کڵێسا و چی بکەی لە تاوان وخراپە ، ئەوا ئەم چەکی لێخۆشبوونەت هەیە وەکو منداڵێکی بێ تاوانت لێ دەکات و لە دوای مردنیش تەنیا بەهەشتت بۆ هەیە ، لێرەوە جولەکە و کاور لە پاساوی خراپەکاریدا یەکسانن ، جولەکە هەموو شتێك دەکات کە تەنیا ژیانی دونیای بۆ هەیە و ژیانێکی دیکەی نیە ، بۆ کەسی گاوریش بەرامبەر چەکێکی غوفران تەنیا بەهەشت هەیە ، سزای دوا رۆژیش کە مەسیح ( علیە السلام ) جەختی لەسەر دەکردەوە بوویە قوربانی چەك فرۆشانی غوفران – نوسەر .

## ئینجیلی بەرنابا و گێڕانەوەی باسی مەسیح

ئینجیل ، کتێبی دابەزێنراوی سەر عیسای مەسیح ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) بۆ گەلی جولەکە، کە عیسا ( علیه السلام ) لە نێون یانزە قوتابی ( حەواریەکان ) نامێنێ و دەبردرێتە ئاسمان، ئەم ئینجیلە تۆمار نەکراو بوو، وەکو لەو باسانەی پێشووتر رابوورد ئەوەی لە نێو نەسرانیەکاندا ئەمڕۆ رەواجی هەیە چوار ئینجیلە کە ( مەتا ، مرقس ، لۆقا ، یۆحنا ) یە، پەسەند کردنی ئەم چوار ئینجیلەش لە لایەن جلاسیۆسی یەکەمەوە بووە و ئینجیلەکانی دیکەی حەرام و قەدەغە کردووە، هەمووی بە رێدراو ورێنەدراوەوە بە جێ دەست و بیری مرۆڤەوە دیارە، ئەوەی کە نەسرانیەکان ( مەسیحیەکان ) بە تایبەت ئەو گەورانەیان کە ساویلکەیی پێناسەی خەڵکی دەکەن زۆر دژایەتی ئینجیلی بەرنابا دەکەن ، وەکو ئەوەی لە نامیلکەی ( درۆ و ساختەی نوسراوی بەرنابا ) دا و لە بڵاو کراوەکانی کڵێسای مەسیحی کورد زمان بە کوردی کراوە و سەر سەختانە دژایەتی کراوە، ئینجیلی بەرنابا وەکو خۆیان دەیڵێن لە سەدەی پێنجەم نوسراوەتەوە، بەڵام بەرنابا تاوەکو ئەو سەردەمە نەژیاوە، ئەوەی لەم بارەیەوە دەفامرێ ئەوەیە، ئەم ئینجیلە لە کتێبخانەی پاپادا بووە وقەشە مارینۆ سەردانی کردووەو لە کتێبخانەکەدا کاتێك پاپا خەوی لێ کەوتووە ( قەشە مارینۆ ) تەماشای کتێبەکان دەکات و چاوی دەکەوێتە سەر ئینجیلی بەرنابا و بە شاراوەیی دەیبات و پاش خوێندنەوەی دەبێتە موسڵمان . مەسیحیەکان، گەورە و بڕیار دەرەکان و ئەوانەی چاویان بە حەقیقەت هەڵنایەت زۆر لە هەوڵی بە درۆ خستنەوەی ئەم ئینجیلەن، ئەم ئینجیلە بە زمانی ئیتالی نوسراوە و لەسەر پێستە تۆمار کراوە، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی، لونسدال راغ جێگری کڵێسای ئینگلیزی لە فنیس و زانای وردبین خاتوو لوراراغ رێگەیان داوە بە د . خلیل سعادە کە مەسیحیە وەرگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی و محمد رشید رضا کە زانا و خاوەنی چاپخانەی ( المنار ) بووە لە چاپی داوە .

دەوترێت کە نوسەری ئەم ئینجیلە مەسیحیەکی موسڵمان بووە، یان لە پاشماوەی ئەو جولەکانی ئەندەلوسە ( ئیسپانیا ) کە موسڵمان بووە، بەڵام د . مرجلیۆسی ئینگلیزی رەتی کردۆتەوە کە دانراوی موسڵمانان بێ

( درۆ و ساختەی نوسراوی بەرنابا ) کە دەزگا بە ناو خێرخوازییەکانی مەسیحیەکان لە کوردستان بڵاویان کردۆتەوە چەند بەڵگەیەکی هێناوەتەوە بۆ ساغ نەبوونی پاڵدانی ئەم ئینجیلە بۆ لای بەرنابا، گەرچی باوەڕیان بەوە نیە مەسیح قوتابیەکی هەبووبێ بەناوی بەرناباوە و ئەڵێن یوسفی ناو بووە، لەوانە بەڵگەی مێژوویی و جوگرافی، بەڵام ئەوەی سەغڵەتیانی کردبێ ئەوە نیە، ئەوەیە کە وەکو خۆیان دەیڵێن ئەوەیە کە ئینجیلی بەرنابا دژ بە بیر وباوەڕی مەسیحیەتە، لە بەرگەکەی ئەو نامیلکەیەدا نوسراوە یەك خوا هەیە ، کەچی بەرناباش لەوە زیاتری نەرتووە ، تەنها یەك ئینجیل هەیە، بەرناباش هەروا ئەڵێ، کە ئینجیل یەك ئینجیلە و بۆتە چوار و پێنج و ..... هتد ، نوسراوە تەنها یەك باوەڕ هەیە هەروا دەڵێ کە ئێستا لەو ئاینەدا باوەڕ شێواوە، ئاخۆ گەر یەك خوا هەبێ بۆچی ئینجیلی بەرنابا دژ بە بیر وباوەڕی مەسیحی پێغەمبەر بووبێ کە لە لاپەڕە ( ٢٠ ) ی ئەو نامیلکەیەدا بەم جۆرە رەخنەی لە بیر و باوەڕی نێو بەرنابا گیروە :

نووسەری کتێبی بەرنابا سوورە لەسەر ئەوە چەند جارێك ئەوەی رەت کردۆتەوە کە مەسیح خودایە و خوداوەندێتی مەسیحی رەت کردۆتەوە بەم شێوەیە : [1]

١. مەسیح معجیزەکانی بە رێگەدان لە لایەن خوداوە ئەنجام داوە نەوەك بە هێز و توانای خۆی ( بەرنابا١١- ١٩ ) .

٢. مەسیح توانای نیە تەنها مێشێکیش دروست بکات( بەرنابا ١٢٨ ) .

٣. مەسیح ناتوانێتە لە گوناهەکان خۆش بێت ( بەرنابا ٧١ ) .

٤. ئەم بیر و باوەڕە بت پەرستیە سەربازە بت پەرستەکانی رۆمان رتوویانە ( بەرنابا ٤٨- ٩١ ) .

---

[1] ئەمە و ئەو چوارخاڵەش نوسینی نێو ئەو نامیلکەیەیە و کراونەتە رەخنەی راست نەبوونی ئینجیلی بەرنابا !

بێگومان ئێمە لە (ئینجیل ) ی راستەوە دەزانین کە مەسیح خودایە، ناوەکانی خودای هەیە و خاسیەتەکانی خودای هەیە ئەو کارانەی کردووە کە یەزدانی کردوویەتی، ئەمەش لە لایەن خۆیەوە راگەیەندراوە لە رێی وەحی رۆحی پیرۆز بۆ قوتابییەکانی و نێردراوەکانی .
ئاخۆ ئەوەی لە بەرنابادا هاتووە بیر وباوەڕی مەسیحیە، یان ئەوانەی دژەکەی کە سیفەتی خوایەتی دەدەنە پاڵ مەسیح ؟
لە لاپەڕە ( ٤٧ ) یەکێك لە گەنجەکان دەڵێ* گەر بەرنابا ئینجیل بوایە رۆحی پیرۆز دەیپاراست، من دەپرسم ئەی رۆحی پیرۆز بۆ ئەو ئینجیلەی تەواوەی نەپاراست تاوەکو بوویە چوار و زیاتر ؟ ئەی خۆی بۆ نەپاراست وەکو ئەوەی ئێوە دەیڵێن کە لە خاچدراوە ؟ رەخنەکانیش لەوەی چۆن ناوی ( موحەممەد ) هاتووە ؟ ئەوە مافی خۆتانە، چونکە ئێوە توانیوتانەی وشەی ( باریکلیتۆس ) و چەند وشەیەکی دیکە بپڕنەوە کە مانای ( ئەحمەد ) دەدات، وەکو ( ولیم مور ) دەڵێ : لە مێژوودا زۆر کەس بوونە بانگەشەیان کردووە کە ( باریکلیتۆس ) بارقلیتن . وەکو قەشە داڤید بنجامین کلدانی کە ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ پرۆفیسۆر(عبدالأحد داود) لە کتێبی ( محمد في الکتاب المقدس ) ناو و سیفەت و شوێنی ئەم موحەممەدی پێغەمبەرەی ئاشکرا کردووە و جارێك لە جاران ئەوانەی دژی بیر و باوەڕی مەسیح و تەواوی پێغەمبەران دەجوڵێنەوە باسی ناکەن، تەنیا ئەوانە نەبێ کە راستی هەڵدەبژێرن و دەبنە خوا ویستی راستگۆ.
لە خاچدانی مەسیح ( علیه السلام ) لە گێڕانەوەی ئینجیلدا :پێغەمبەران ، خوای گەورە رێزی زۆری لێ ناون، قورئانیش زۆرێك رێزی پێغەمبەرانی تێدایە، خوای گەورە باس لە کۆبوونەوەی جولەکە و رۆمانەکان دەکات بۆ لە نێو بردنی مەسیح، لەوەشدا فەرموویەتی کە مەسیح لە خاچنەدراوە و ئەوەی لە بریتی لە خاچدرابێ یەهوزای خوێندکاری بووە ( قورئان تەنیا باس دەکات کە کەسێکی دیکە لە شێوەیدا لە خاچدراوە )،

---

* ئەم ناميلکەيە لە شێوەی گفتوگۆ دارێژراوە

هەر چوار ئینجیلەکە ( مەتا ، مرقس ، لۆقا ، یۆحنا ) نزیك لە یەك شت دەگێڕنەوە، کە یەهوزا پلانی دژ بە مامۆستاکەی کە عیسا بووە، گیراوە و لە بەرامبەر زنجیر و زیودا شوێنی مەسیحی بە کاهین و والی داوە و ئەوانیش مەسیحیان قۆڵ بەست کردووە، کە مەسیح گیردراوە قسە و لێدانی زۆری پێ دەکرێ و تف باران دەکرێت و بە گاڵتە جارییەوە پێی دەڵێن ( سلاو ئەی پادشای جولەکە ) و دەیبەنە لای خاچ بۆ لەخاچدان و لە نێوان دوو دزدا لە خاچی دەدەن، دوای ئەوەی لە خاچی هەڵدەواسن پێی دەڵێن گەر کوڕی خوا بی ئەوە لە خاچەکە وەرە خوارەوە ، دەڵێن : عیسا ( علیە السلام ) وتوویەتی : خواوەندە ، خواوەندە بۆ وازت لێ هێنام ؟ ! یەسوع بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات و گیانی دەردەچێ، لەو کاتەدا هەیکەل دەبێتە دوو کەرتەوەو خەڵکەکەش دەڵێن بە راستی کوڕی خوا بوو ، .... یوسف ناوێك کە خوێندکاری بوو لە بیلاگی داوا دەکات کە لاشەی مەسیحیان پێ بدرێتەوە بۆ بە خاك سپاردنی .... زۆرێك دەدوێن دەڵێن یەسوع خۆی پیشانی خوێندکارەکانی دەداتەوە دەڵێ: بڕۆن و هەموو نەتەوەکان شارەزا بکەن و بەناوی خوا و کوڕی خوا و رۆحی خوا خەڵکی تەعمید بکەن .

بە روانین بۆ ئەو باسانەی نێو ئینجیلەکانی ئێستا دەبینی هەر سەربردە گێڕانەوەن، وەکو ئەوەی کەسێ دابنیشێ شتیك بنووسێتەوە، ئینجیلەکان پڕ بەو باسانەن و گومانی پێغەمبەرەکان لە خوا پیشان دەدەن، عیسایەك ( علیە السلام ) خوا بە رێزەوە باسی بکات و پێغەمبەری خۆی بێ، چۆن قوتابیەکانی خۆی دەخاتە سەر رێگەیەك کە بۆنی شیرك و بێ باوەڕی لێیەوە بێ، بۆیە زۆر بە جوانی دەست و پەنجەی بۆڵس و راهیب و بتە پەرستەکان لە داڕشتنی ئینجیلەکانی ئێستادا دیارن .

گەورەی کاهینەکان ( هیرۆدت ) ی هاندا و هەر دوو لە سەر کوشتنی مەسیح رێك کەوتن و بە گەورە کاهینەکان وترا : هەر کە شوێن ئەو خراپە کارەت زانی ئێمە ئاگادار بکە تاوەکو سەربازت بۆنێرین و لەو رۆژەشدا لە گشت لایەکی ئورشەلیم بۆ دۆزینەوی ( مسیح ) پشکنینی گشتی ئەنجام درا،

مەسیح لە ماڵ ( نیقۆدیمۆس ) بوو، خوێندکارەکانی ئاگادار کردەوە کە کاتی بــە جــێ هێــشتنی دونیــایی هــاتووە و دڵدانــەوەی کــردن ....

ئێوە ببنە شایەت بۆ من لەسەر هەموو ئەو کەسانەی ئەو شایەتیە نامێڵن کە بە ئینجیلەکەم شایەتی تیادا هاتووە، پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ خوا و فەرمووی : ئەی پەروەردگارمان، خوای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقی باپیرمان رەحم بەو کەسانە بکەی کە باوەڕیان بە من هێناوە و بە منت بەخشیون، لەم جیهانەدا دڵسۆز و رزگاریان بکەی، ناڵێم لەم جیهانەدا بیانبەیتەوە، چونکە پێویستە ببنە شایەت لەسەر ئەو کەسانەی ئینجیلەکەم دەشێوێنن، لێت دەپاڕێمەوە لە خراپەکاران بیانپارێزی و لە رۆژی لێپرسینەوەدا ( قیامەت ) لە تەکمدا ئامادەیان بکەیت و ببنە شایەت بەسەر جیهان و گەلی ئیسرائیل کە پەیمانی تۆیان لە نێو برد، ئەی خوای بە توانا تۆڵە سێن بە لە بت پەرستان و لە نەوەکانی چوار نەوە، بۆ هەمیشە نەفرەت بکەی لەو کەسەی ئینجیلەکەم دەشێوێ کە تۆ بە منت بەخشیوە و وەهای تیادا دەنوسن کە من کوڕی تۆم، من گڵ و خۆڵم و خزمەتکاری خزمەتکارەکەتم، هەمیشە خۆم بە خزمەتکارێکی شیاو بۆ تۆ نەزانیوە [1]

مەسیح دەست و سەر و قاچی هەموو هاوەڵەکانی شۆرد، پاشان فەرمووی : ئێستاش هەمووتان پاك نین، چونکە ئاوی دەریا کەسێك پاك ناکاتەوە کە باوەڕی بە من نەبێ، عیسا دەیزانی کە یەهوزا شوێنەکەی ئاشکرا دەکات، خوێندکارەکان لەو قسەیەدا دڵتەنگ بوون، یەسوع وتی : راستیتان پێ دەڵێم کە یەکێك لە ئێوە وەك کاوڕ دەمفرۆشێت، بەڵام لە نێو چوون بۆ خۆی، چونکە هەر ئەوە سەرەنجامی دەبێ کە داودی باوکمان لە بارەیەوە وتوویەتی : دەکەوێتە ئەو چاڵەوە کە بۆ کەسانی تری کەندووە خوێندکارەکان بە خەمباریەوە دەیانڕوانیە یەکتری، ئاخۆ ناپاك کێ بێ ؟ ئەوکات یەهوزا وتی ئەی مامۆستا ئاخۆ منم ؟

---

[1] ئینجیلی بەرنابا ٣٠٤ – ٣٠٥

مەسیح وتی : ئەوەت پێم وت کە شوێنم ئاشکرا دەکات، بەڵام یانزە هاوەڵەکەی تر ئەم قسانەیان نەبیست ........ دوای دەرچوونی یەهوزا لەماڵەکە و نوێژ کردنی مەسیح لە بێستانەکەی دەرەوەی ماڵەکە، یەهوزا دەچێتە لای سەرۆکی کاهینەکان و دەڵێ : گەر ئەوەم بدەنێ کە دەمەوێ ئەوا ئەم شەو مەسیحتان دەدەمە دەست، ئەو بە تەنیا لەگەڵ یانزە هاوەڵدایە، گەورەی کاهینەکان وتی چەندت دەوێ، یەهوزا وتی سی پارچە ئاڵتون، هەر ئەو کاتە گەورەی کاهینەکان بەڵێنی پێدا و هیرۆدسی ئاگادارکردەوە بۆ هەناردنی سوپا، کە یەهوزا و سوپا لە شوێنی یەسوع نزیک بوونەوە، یەسوع گوێ ی لە دەنگێك بوو، یەسوع گەڕایەوە ماڵەوە ،هاوەڵەکانی خەوتبوون، کە خوای گەورە بینی بەندەکەی لە مەترسیدایە جبریل و میخائیل و رفائیل و ئەوریلی نارد تاوەکو یەسوع بۆ ئاسمان ببەن و لە پەنجەرەی رووی باشوورەوە بۆ ئاسمانی سێ یەم هەڵیانگرت، یەهوزا بە توندەوە هاتە ئەو ژوورەوە کە عیسای تیادا بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە، خوێندکارەکان خەوتبوون، خوای گەورەش کارێکی سەرسوڕهێنەری ئەنجام دا، یەهوزا لە شێوە و قسەدا وەکو مەسیحی لێهات و ئێمەش باوەڕمان وەها بوو کە یەسوعە، دوای ئەوەی ئێمەی لە خەو هەڵساند و وتی : کوا مامۆستا لە کوێ یە ؟ بەلامانەوە سەیر بوو وتمان : ئەی گەورە تۆ مامۆستامان نیت، ئێمەت لە بیر چووەتەوە ؟ بە بزەیەکەوە وتی : ئاخۆ ئێوە گێلن تاوەکو یەهوزای ئەسخەریوتی نەناسن .

سەربازەکان هاتنە ژوورەوە ئەویش وەهای دەوت، یەهوزایان گرت، چونکە لە مەسیح دەچوو، ئێمەش کە دەنگی یەهوزامان بیست و سەربازەکانمان بینی وەکو شێت هەڵهاتین، یۆحناش خۆی بە کەتانێك پێچایەوە و هەڵهات، سەربازەکانیش بە گاڵتە جاڕیەوە یەهوزایان قۆڵبەست کرد و هەرچی دەیوت کە یەهوزام نەك یەسوع سودی نەبوو، چونکە لە شێوە و دەنگدا خوا

بردبوویه سەر مەسیح و پێیان دەوت مەترسە هاتووین تاوەکو بتکەینە پادشای ئیسرائیل !..... گەرچی هیرۆدۆس و بیلاتس زانیان کە قوڵبەستکرا و یەهوزایە، پاشان خوای گەورە بۆ دڵنیاکردنی دایکی و خوێندکارەکانی بە هاوەڵێتی جبریل و چەند فریشتەیەك یەسوع هاتە سەر زەوی و بۆ چەند ڕۆژێك لای دایك و هاورێکانی مایەوە

لەو کاتەدا سوپای ڕۆمان لە ناو جولەکەدا بوو، چونکە بەهۆی هەڵە وتاوانی ئەوانەی پێشومانەوە ولاتەکەمان ژێر باری ئەوان بوو، نەریتی ڕۆمانەکان وەها بوو کە هەرشتێکی تازە بکات و سوودی بۆ گەل هەبووایە دەیانکردە خواوەند و دەیانپاراست، سەربازەکان لە ( تایین ) بوونو یەك لە دوای یەك وتیان : خواوەندێکتان سەردانی کردن ئێوەش ڕێزتان لێ نەگرت و هاوکاریتان نەکرد، بە راستی گەر خواوەندی ئێمە سەردانمان بکات هەموو شتێکی پێ دەدەین کە هەمانبێ ، دەبینن چەند لە خواوەندەکانمان دەترسین کە چەندە بە پەیکەرەکانیان دەبەخشین، شەیتانیش بەو شێوازە وەسوەسەی بۆ دروست کردن و لە نێو گەلی تایین دەنگ و باس وروژا، یەسوع لە تاین نەمایەوە و رۆیشت بۆ ( کفر ناحوم ) ، هەندێ لە خەڵکی ( تایین ) وتیان ئەوەی سەردانی کردین خواوەندمانبوو، هەندێکی تریان وتیان : خوا نابینرێ و تەنانەت موساش نەیبینی، بەڵکو کوڕی خوایە، کەسانی دیکە وتیان : نە خوا و نەکوڕی خوایە ، خوا جەستەی نی یە ، بەڵکو پەیامبەرێکی گەورەی خوایە .[1]

لێرەدا ئینجیلی بەرنابا باس لەو هاوڵپەیداکردنە دەکات کە خەڵکی گیرۆدەی بوو بوون و دەگێڕێتەوە :

جارێکیان یەسوع رێز لە کاهینێك دەگرێ و لێ ی نزیك دەبێتەوە و کاهینەکە بۆ مەسیح کڕنوش دەبات، مەسیح هاوار دەکات و دەڵێ: وریابە ئەی کاهینی خوا بەرامبەر بە خوا هەڵە مەکە .

---

[1] بەرنابا ٧٤ ، ٧٥

کاهینەکەش دەڵێ : جولەکە لە بەرامبەر بەڵگە وموعجیزەکانت سەرسوڕمان بوونە ودەریدەخەن کە تۆ خوای، بۆیە من و والی ڕۆمان و هیرۆدۆسی پادشا هاتوینەتە لات و لە دڵەوە داوات لێ دەکەین، ئەم پەشێویە نەمێنێ کە بە هۆی تۆوە دروست بووە، چونکە کۆمەڵێك دەڵێن تۆ خوای، هەندێکی تر دەڵێن کوڕی خوای، هەندێکی تر دەڵێن تۆ پەیامبەرێکی . مەسیحیش وەڵامی دایەوە : ئەی تۆ ئەی سەرۆکی کاهینان بۆ ئاژاوەکە دانامرکێنیتەوە ؟ بەرامبەر ئاسمان و هەموو کەسی سەر زەوی شایەتی دەدەم من دوورم لەو هەموو شتانەی خەڵکی دەیڵێن، من لە دایك بووی ئافرەتێکم .

گەلی ئیسرائیل ئێستا ویستیانە ئەو بت پەرستیە دامەزرێنن کە دڵیاندایە بەوەی بە خوام دەزانن .[1]

برنابا دەپرسێ و ئەڵێ : ئەی مامۆستا چۆن جاران لە نێوماندا بووی ئەکرا پرسیار بکەین، ئێستاش دەتوانین ؟

یەسوع ئەڵێ : چیت دەوێ برنابا وەڵامت دەدەم .

بەرنابا وتی : ئەی مامۆستا خوا بە سۆزە، بۆچی بەم ئەندازەیە سزای داین کە وەهامان زانی مردووی ؟ دایکت ئەوەندەگریا خەریکبوو بمرێ و خوا ڕێگەیدا عاری کوشتنی نێوان دزانت بکەوێتە سەر و تۆش پیرۆزی خوای .

مەسیحیش وەڵامی دایەوە : ئەی برنابا خوای گەورە لەسەر هەموو تاوانێك سزا دەدات گەرچی تاوانی بچووکیش بێت، خوا لە تاوانکاری توڕەیە، لەبەر ئەوەی دایکم و خوێندکارەکانم خۆشەویستی لە رادەبەدەریان بۆم هەبوو، خوای گەورە ویستی بە غەم تۆڵە بکاتەوە تاوەکو بە بڵێسەی ئاگری دۆزەخ نەبێ، خەڵکی کە بە خوا و کوڕی خوا بانگیان دەکردم منیش لەوە بە دوور بووم، خوای گەورە ویستی بە مردنی یەهوزا کە وەهایان زانی منم رایان چەڵەکێنێ و تاوەکو شەیتان لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا بە من رانەچەڵەکێ، کاروباریش وەها دەمێنێتەوە تاوەکو موحەممەدی نێردراوی خوا دێت و ئەم فڕوفێڵە بۆ باوەڕدارانی شەریعەتی خوا دەردەخات [2]

---

[1] بەرنابا لا ١٤٢ ، ١٨٠ .

[2] بەرنابا ٢١٨

یەسوع و داواکاری لە برنابا

یەسوع لای کردەوە لای بەرنابا کە خەریك بووی دەینووسی : ئەی بەرنابا پێویستە ئینجیلەکەم بنوسیتەوە و کاروباریشم لە جیهاندا ، هەروەها ئەوەش بنووسە کە بەسەر یەهوزادا هات تاوەکو ئەو فرۆفێڵە نەمێنێ کە لای باوەڕداران درووست بووە

کاتێ مەسیح رایگەیاند کە خوێندکارەکان بە جێ دەهێڵێ، خوێندکارەکانی دڵتەنگ بوون کە بە جێیان نەهێڵێ، مەسیحیش وەڵامی دایەوە : ( شپرزە مەبن و مەترسن ، من ئەو کەسە نیم کە ئێوەم خولقاندبێ، بەڵکو ئەوە خوایەی کە ئێوەی خولقاندووە دەتانپارێزێ، هاتنی من تەنیا رەخساندنی رێگەیە بۆ هاتنی پەیامبەری خوا، کە بۆ رزگارکردنی جیهان دێ، بەڵام وریابن شێوەی لێتان تێکبچێ، چونکە پێغەمبەر گەلێکی درۆینە دێن کە قسەی من بەکاردەهێنن و ئینجیلەکەم تێك دەدەن

لە چیای زەیتوون لەگەڵ کۆمەڵێ لە فریشتەکاندا خواحافیزی لە دایکی و دوو خوێندکارەکەی دەکات و دەچێتۆ ئاسمان .

ئەوەش سەربردەی ئەو لە خاچدانەیە کە لە ئینجیلی بەرنابادا هاتووە و نزیك لە یەکتاپەرستیە و ئەوەی لە قورئاندا هاتووە تەنیا باسکردنە لەوەی عیسا ( علیە السلام ) لە خاچ نەدراوە و کەسێکی دیکە لە شێوەی لە خاچدراوە ، عیسا ( علیە السلام ) براوەتە ئاسمان، هاتنە خوارەوەی بۆ لای قوتابیەکانی باسی نیە، قسە کردن لەسەر ئەوەش بە راست خستنەوەی یان پێچەوانە ناتوانرێت، چونکە دەچێتە ئەو بارەی کە موحەممەدی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) دەفەرموێت : نە ئەهلی کیتاب بە راست بخەنەوە و نەش بە درۆیان بخەنە ، ئەوەش ئاماژەیەکی پیرۆزە بۆ دوور بوون لە کەوتنە هەڵەوە.

# بەشی چوارەم

## شەریعەتی خوایی لە پێش ئیسلام

## بانگەوازی موحەممەدی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە تەورات و ئینجیلدا

## دەرکەوتنی ئیسلام و هەڵوێستی ئەهلی کیتاب .

## شەریعەتی خوایی لە پێش ئیسلام

بە تێپەڕبوونی کات، ڕۆشنایی یەکتاپەرستی و بانگەوازی خوایی پێغەمبەران بەرە و کز بوون دەچوو، عیسای مەسیح ( علیه السلام ) لە پێغەمبەرێکی خواوە کرا بە خواوەندی گاورەکان، کڵێساش بوو بە بڕیاردەری خراپەکاری و پاساودانی تاوانەکان و پیاوانێك کە راستەقینەیی نەناسن و بە چاو نەیبینن، تاوەکو بۆ ساتێکیش بێ رێگەی راستی ژیان بگرن و لە دەرەوەی بازنەی ئەحبار و راهیبەکان بیربکەنەوە، پەرتوکە ئاسمانیەکەی هەردوو نێردراوی خوا ( موسا و عیسا ) سەلامی خوایان لەسەر بێ شێوێندرا و بوویە چەکێکی مامەڵە کردن و کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و گەڕان بە دوای بڕیارداندا، هەروەکو پەروەردگار دەفەرموێت :

((إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ )) [1]

واتا: زۆرێك لە ئەحبار و راهیبەکانی جولەکە و گاورەکان سەروەت و سامانی خەڵکی بە نا هەق دەخۆن و رێگری ئاینی خوا دەکەن .

ژیان لەو دەمەدا لە شپرزەییدا بە رێکراوە، گاورەکان ( مەسیحیەکان ) خاوەن دەسەڵات و جولەکەکانیش ژێر بار و پەرتەوازەی وڵاتان بوونە، هەریەکە و لە دەوری زانایەك کۆبوونەتەوە و گوێڕایەڵی خواییان بەو زانایە داوە .

هیچ یەك لەم دوو ئاینە کاریگەریان بەسەر نیمچە دورگەی عەرەبەوە نەبووە، بە تایبەت مەککە، ئەوەی شوێنەواری ئاینی بوو بێ لەو نیمچە دورگەیەدا، تەنیا بوونی کەعبەی پیرۆز بووە کە ئیبراهیمی پێغەمبەر و ئیسماعیلی کوڕی دروستیان کردووە، ئەگینا بوونی پەرتوکێك یان هەر

---

[1] سورەتی : التوبة ، ئایەتی ٣٤

شتێکی دیکە لە نێو عەرەبدا نەبووە، کەعبە کە بە ماڵی خوا ناسراو بووە لە
پاڵیدا بت و پەیکەری زۆر هەبووە قورەیشیەکان بە خواوەندی خۆیانیان کرد
بوو، نەریتی ئەو نیمچە دورگەیە وەکو چۆن لە نێو کۆمەڵگاکانی دیکەدا بار
بووە بە کەمگرتنی هەژاران و سووك روانینە ئافرەت و بێ نەوایان ئاوەها
لەو کۆمەڵگەیەدا هەبووە، هەر لە کوشتن و وێران کردن و هەڵکوتانە سەر
هۆزەکان کە نەریتێکی شانازی پێ کراو بووە، ماف مرۆڤەکانیش زۆر
لەبارێکی خراپدا بووە، لە برسی کردن و کوشتن و ئاغایەتی نواندن و
پۆلێنکردنی ریزەکانی کۆمەڵگە.

( ج ، ه ، دینسۆن ) لە کتێبەکەیدا : العواطف كأساس الحضارة

Emotion as the basis of civilization

دەڵێ :

لە هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشدا، جیهانی ئایندار لە لێواری رووخان و
هەرەس و پڕ لە پەشێویدا بوو، چونکە ئەو بیروباوەڕانەی مەبەستی ژیار
دروست کرد بوو، هەرەسی هێنا بوو، شتێك نەبوو بیکاتە پایەی هەستانەوە،
ئەو شارستانیەتە گەورەیەش کە هەوڵی چوار هەزار ساڵی ویست لە
هەڵوەشاندندا بوو، مرۆڤایەتی لە نزیکی گەڕانەوەی دووەمدا بوو بۆ
هەمەجیەت، هۆزەکان لە جەنگان و سەربڕیندا بوون یاسا و سیستم نەبوو،
ئەو سیستمەش کە مەسیحیەت دروستی کرد بوو لەسەر پەرتەوازەیی و
هەرەسهێنان بوو لە جیاتی یەکگرتن و سیستم، شارستانیەت وەکو دارێکی
گەورە وا بوو لق و پۆی جیهان دابگرێ، وەستاو و قوڕاوی بوو ....... لە نێو
دیمەنی ئەوخراپە گشتگیرەدا ئەوپیاوە لە دایك بوو کە جیهانی یەکخست)[1]

/

[1] محمد قطب : الصحوة الاسلامية ، ل ١٨٦

کاری ئەوان و ئاینیە شوێندراوەکان، هۆکاری بە کۆیلە کردنی خەڵکی و شێواندنی ناوبانگی پێغەمبەران بوو، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بۆ ئیمانداران وێنەی کاری بانگەشەکارانی ئاینداری جولەکە و گاورمان بۆ باس دەکات، ئەوەش لە روانگەی مێژوویەوە سوودی زۆری هەیە بۆ پەند وەرگرتن، چونکە مرۆڤ لە ناسینەوەی خۆی و دەوروبەریدا دەتوانێ ئەنجامی باش وەربگرێت، خوای گەورە وێنەیان دەگێڕێتەوە بۆ پەندی خەڵکی بە گشتی و باوەڕداران بە تایبەتی، بۆ ئەوەی ئاینی خۆیان بپارێزن و جێ پێی کەسانی تر هەڵنەگرن، پەروەردگار دەفەرموێت :

(( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ )) [1]

واتا : ئەی ئەوانەی باوەڕدارن بە خوا و باوەڕتان بە خوا و قورئان هێناوە ئەوانە مەکەنە دۆستی خۆتان لە ئەهلی کتاب و بێ باوەڕان کە گاڵتە و توانج دەگرنە ئاینتان و بیر و باوەڕتان بە سووك تەماشا دەکەن، دۆستایەتی و رێزیان لێ مەگرن، لە خوا بترسن و دۆستایەتیان مەکەن بەهۆی ئەوەی رێز لە ئاینەکەتان ناگرن و لە خوا بترسن گەر بە راست بڕوادارن .

جولەکەی بێ قەوارە و دەسەڵات ، بە پەرتەوازەیی لە نێو نەتەوە و میللەتە جیاوازەکاندا دەژیان، زاناکانیان کتێبەکانیان بۆ نووسینەوە بەپێی ئارەزووی خۆیان، بەسەر زمانی پێغەمبەران قسەیان هەڵدەبەست و تانەیان لە پێغەمبەران دەدا و حەرام و حەڵاڵەکانی خوایان ئاڵوگۆڕ دەکرد ! ، لە تێکەڵی کردنی گەلانی دیکەدا دوورە پەرێز بوون، مەگەر بۆ بەدی هاتنی ئامانجێك نەبووایە، لەوەشدا پیرۆزترین شتیان دەبەخشی .

---

[1] سورەتی : المائدە : ئایەتی ٥٧ .

خوای گەورە کتێبەکانی دەنارد تاوەکو بەرنامەیەکی پیرۆز بێ و مرۆڤ لە دانانیدا دەستێوەردانی بۆ نەبێ، بۆ ئەوەی کەسانێکی راستگۆی دەستپاک و بە غیرەت لە دەوری ئەو بەرنامەیە کۆ ببنەوە، چونکە کەسانی دەستپاک و بە ئەمەك مەرجی سەرکەوتنی هەر بەرنامەیەکن، بەرنامەیەکی ئاسمانی بێ یان دانراوی دەستی مرۆڤ .

گەر شوێنکەوتەکانی هەر ئاینێك ئەو سیفەتە جوانانەیان لە دەستدا، ئەو کات ئاین دەبێتە بەرنامەیەکی پەراوێزخراو و کەلوپەلی دەستی کەسانێك کە پێی شیاو نەبن، شوێنی وەدیهێنانی ئەرکە کاتیەکانی ئەو ئاینەش دەبێتە بازاڕی کڕین و فرۆشتن و گران کردنی ئەم کەلو پەل و هەرزان کردنی ئەو کەلوپەل و فرۆشتنی ئالْتون بە زیوو ! ئەم شێواندنە کەوتە نێوگاورەکانیشەوە، ئاینێك گۆڕدرا و کورت بوویەوە لەوەی تەنیا یەك شت گرانە، ئەویش ئەوەیە کە مەسیح خوایە یان کوڕی خوایە یان رۆحی قودسە و تەنیا لە پێناوی تاوانی ئەواندا لە خاچدراوە

یان دەوترێ کە خەڵکی بە بێ رێزیەوە تەماشای مەسیح دەکەن وپشتیوانی لێ ناکەن و پیاوێکی ئازار چێژە و تاقیگەیەکیشە بۆ دڵتەنگی، خەڵکی بە بێ رێزیەوە تەماشای دەکەن و نایکەنە پێشەوای خۆیان، بەڵام خەمەکانی ئێمەی لە کۆڵ ناوە و ئازارەکانی ئێمەشی هەڵگرتووە، ئێمەش پێمان وایە زەبوون و بریندارى دەستی یەزدانە، لە کاتێکدا ئەو لە پێناو سەرپێچەکانی ئێمەدا بووە و لە پێناو گوناهەکانی ئێمەشدا تێکشکێنراوە، پەروەردگاریش هەموو گوناهەکانی ئێمەی خستووەتە سەر ئەو [٢]

لە ئینجیلی یۆحنا ( ١ ٢٩ ) دا هاتووە کە یۆحنا بە جوولەکەکانی وتووە، ئەمە مەسیحە کە تاوانی جیهان هەڵدەگرێ .

---

[٢] چیرۆکی ئاینەکان : لا ٣٦٧

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ((وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى )) [٢] . واتا : کەس نابێتە هەڵگری تاوانی کەسی تر . گەر بڕیار بووایە عیسا ببووایەتە هەڵگری تاوانەکان، دەبوو حیکمەت چ بووایە لەو هەموو ناڕەحەتیانەی بەسەریدا هات ؟ ! ئەی ئەگەر هەڵگری تاوانەکان و لە ئەستۆ گرتنی لەلایەن عیسای مەسیحەوە ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) لە ئارادا بووایە، بۆچی کڵێساکەی پاپا لێویی دەیەم چەکی غوفرانی دەفرۆشت و بۆ لێخۆشبوون لە هەر تاوانێك لە سەر هەر چەکێك نرخەکەی دەنوسرا ؟ ! چەکی دزین نرخەکەی ئەوەندەیە و داوێن پیسی ئەوەندە و مرۆڤ کوشتن ئەوەندە و ...... هتد ، بە راستی کڕین و فرۆشتنێکی لەو جۆرە هەر لە بازاڕی میوە و بەهاراتدا دەکرێ ببێ !

ئەوان باوەڕیان وەهایە کە خوای گەورە دابەزیووەتە سەر زەوی و لە منداڵدانی ئافرەتێك ژیاوە و پاشان لە وێنەی منداڵێکی لە دایك بوو لە داوێنیەوە دەرچووە

لە ئینجیلدا هاتووە کە ئەوانەی قبوڵیان کردووە، واتا باوەڕیان بە ناوەکەی هەبووە، ئەو مافەیان هەیە ببنە کوڕی خوا، ئاخۆ باوەڕی مرۆڤ هەرچۆن بوو بێ دەکرێ ببێتە کوڕی خوا ! . خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە تاوەکو چەمکی باوەڕی راستەقینەیی دابمەزرێ، کە لە دڵدا سەوز دەبێو لە زماندا دەبیسترێ و لە کرداریشدا رەنگ دانەوەی هەیە، ئەوەی ئەوان کردوویانە تەنیا هەراج کردنی ژیان و ئامانجی پێغەمبەرانە، کەوا بوو حیکمەت لە دروست بوونی مرۆڤدا چیە، بۆ پەرستنە یان تەمبەڵی ؟ ئاخۆ پێغەمبەران لەوەدا رازین بەرامبەر باوەڕ هێنانێك خۆیان بەخت بکەن بۆ ئارەزووی مرۆڤەکان ؟ ! بەختکاریەك وەکو ئەوان دەیڵێن هەر دزی و داوێن پیسی و رەوشت نزمییەك خواوەندی لە خاچدراو بە ئەستۆی بگرێ

---

[٢] سورەتی فاطر : ئایەتی ١٨

له وەها ژینگەیەکی پێش ئیسلامدا ئەو شێوە ژیانە بینراوە، هەریەك لە جولەکە و گاور قسەی زۆریان لەسەر زمانی پێغەمبەران دروست کردووە، هێرشیان کردووتە سەر کەسایەتی پێغەمبەری بەرامبەر و بە لادەر و درۆزن و گەڕان بە دوای ویستیدا تاوانباریان کردووە، لە پێناو دەسەلات، ئاژاوەگێڕیش شێوازی جۆربەجۆریان گرتۆتە بەر لە فروفێڵ و پیلان و کوشتن و خزان لە زەلکاوی خراپەکاری و کوتانە سەر بێ تاوانان، لە پاڵ خۆ ژماردن بە شوێنکەوتە و خاوەنی ئاین

**بانگەوازی موحەممەدی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە تەورات و ئینجیلدا :**

ئاشکرایە کە هەر یەك لە تەورات و ئینجیلی راستەقینە لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەرانی خۆی ناردووە ، کە موسا و عیسایە ( سەلامی خوایان لەسەر بێ )، خوای گەورە ناردوونی بۆ بەنی ئیسرائیل تاوەکو ئاینی خوا بناغەی بڕیاردان و خواپەرستی بێ، رێگە بێ بۆ رزگاربوون لە ستەم کردن و خراپەکاری و زۆرداری و دەرچوون لە فرمانی پەروەردگار، خوای گەورە هەر خۆی دەفەرموویێت (( وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ )) [1]
واتا : بۆ هەموو نەتەوە و میللەتێك پێغەمبەرێکمان ناردووە تاوەکو فرمانیان پێ بکات بە تەنیا پەرستنی خوا و دوورکەوتنەوە لە ستەمکاران، هەیانە خوا رێنوێنی کردوون بۆ ناسینی تەواوی راستی و ماف و هەندێکی دیکەشیان گومراییان بەسەردا سەپاوە و نزیك بە راستی نەبوون، ئێوەش ئەی باوەڕداران بەسەر زەویدا بگەڕێن و بزانن کە ئاخۆ ئەنجام و پاشە رۆژی درۆزنان و بەدکاران چۆن بووە

---

[1] سورەتی النحل ئایەتی ٣٦

هاتنی هەموو پێغەمبەرانی دی بۆ میللەتەکانیان بەڵگەن بۆ فرمانی خوای گەورە لە چەسپاندنی شەریعەتەکەی لە ژیاندا ، پێغەمبەران بانگەوازی یەکتاپەرستنی خوایان لەسەر بووە لە نێو مرۆڤەکاندا لەوەی خوای گەورە سنوری بانگەوازەکەی بۆ دیاری کردوون، هەروەك بانگەوازکردنی قەومی عاد و سەمود و ....... هتد ، لەسەر پێغەمبەران بووە ئەو نیگایانە بە خەڵك بگەیەنن کە خوا بۆی ناردوون، لەوانەش باسکردنی پێغەمبەرانی دوای خۆیان و بە سیفەتی تەواوەوە، موژدەیان داوە . موژدەیان داوە کە کاروانی خوا پەرستی و راستەقینە و رێگە و بیری ساغ بە هاتنی پێغەمبەرانی دوای خۆیان بەردەوام دەبێ

کە خوای گەورە موسا ( علیه السلام ) ی بە پێغەمبەرایەتی نارد تەوراتی پێدا، تاوەکو بیکاتە بەرنامەی بانگەوازەکەی و بەرنامەیەکی تۆکمە بێ و و بەنی ئیسرائیل لە دەوری کۆ ببنەوە و کاری پێ بکەن و ژیانی خۆیانی پێ روونـاك بکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا موژدەی هاتنی پێغەمبەری دوای خۆی داوە، لەوانەش موژدەی بە هاتنی پێغەمبەر موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) دوای چەندین سەدە کە ئاینی خوا زیندوو دەکاتەوە، بۆیە لە تەورات و لە سفری ئەشعیادا لە بارەی موحەممەدی پێغەمبەرەوە هاتووە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت : (( ئەی موحەممەد کاری تۆم کردۆتە جێگەی سوپاس ( محمداً )، ئەی موحەممەد ئەی پیرۆزی پەروەردگار ، ناوی تۆ لە هەمیشەوە بوونی هەیە )) [٢]

هەر لەمەدا لە ئینجیلی ( بەرنابا ) دا هاتووە کە کاتێ ئادەم لەسەر پێی وەستا دوای گیان بەبەردا کردنی، لە هەوادا نوسینێکی بینی وەکو خۆر دەدرەوشایەوە کە نوسرا بوو: (( لا إله إلا الله محمد رسولُ الله )) ئەو کات ئادەم دەمی کردەوە و وتی : ئەی، خوای پەروەردگارم سوپاست دەکەم کە رێزت لێ گرتم و منت دروست کرد، لێت دەپارێمەوە کە تێمگەیەنیت واتای

---

[٢] لە ئینتەرنێتەوە .

ئەم وشانە ((محمد رسولُ الله )) چیە ؟ خوای گەورەش فەرمووی : بەخێر بێ
ی ئەی بەندەکەم ئادەم، پێت دەڵێم تۆ یەکەمین مرۆڤێکی دروست کرا بی،
ئەوەش کە لە هەوادا بینیت ناوی کوڕەکەتە کە دوای چەندین ساڵی تر دێتە
جیهان و پێغەمبەری منە، بە هاتنیشی روناکی بە جیهان دەبەخشێ [٢]

ئەوەی تەورات کە دەڵێ ناوی محەممەد بۆ هەمیشە بوونی هەیە
هەمان ئەو واتایەی هەیە کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت
: (( كنتُ نبياً وإنّ ادم لمنجدلٌ في طينته ))من بە پێغەمبەر کرا و بوومە کاتێ
ئادەم هەر لە گڵدا بوو .

خوای گەورە لە قورئاندا باس لەو بەڵگانە دەکات کە لە تەورات و
ئینجیل لە موژدەدان بە هاتنی موحەممەدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )
دا هەیە و جولەکە و گاورەکانیش باشیان ناسیووە، هەروەکو پەروەردگار
دەفەرمووێت: ((الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا
عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ
الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ
عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ
الْمُفْلِحُونَ )) [١]

واتا : ئەوانەی شوێنی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کەوتوون لە
گاور و جولەکەکان کە لە تەورات و ئینجیلەکەیاندا ناو وسیفەتی هاتووە و
فرمانی چاکەکاری و رێگری خراپەکاریان لێ دەکات و باشی و پاکەکانیان بۆ
حەڵاڵ دەکات و لە پیسیەکانی وەکو عەرەق و دزی و داوێن پیسی و
پیسیەکانی دیکەیان لێ حەرام دەکات و ئەو کۆت وبارە قورسەیان لەسەر لا
دەبات کە خرابوویە سەر شانیان، بۆیە ئەوانەی شوێنی کەوتن رێزیان گرتو
خۆشەویستیان بۆ دەربڕی و سەریان خست و شوێنی ئەو پەیام و روناکیە
کەوتن لە تەکیدا هات، بە راستی ئەوانە لە سەرفرازانن

---

[٢] ئینجیلی بەرنابا ، بەشی سی و نۆ ، لا ٥٨ ، ٥٩

[١] سورەتی الاعراف : ئایەتی ١٥٧

له بەرنابادا باس لەوە هاتووە کە هەموو پێغەمبەرێك بۆ ئەو نەتەوەیە پەیامی پێ یە کە بۆی هاتووە، بەڵام پەیامبەری کۆتا و چاوەڕوان کراو بۆ هەموو نەتەوەکانە و بەسەر ستەمکاراندا زاڵە و سۆز و بەزەییە بۆ جیهان و تێکشکێنەری شەیتانە، خوێندکارێك لە رەچەڵەکی ئەو پێغەمبەرە دەپرسێ کە ئاخۆ پێغەمبەری دوایین لە رەچەڵەکی داودە کە تەورات وەهای باس دەکات ؟ مەسیح ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) دەفەرمووێت : ئەوەی لە تەوراتدا نوسراوە موسا نەینوسیوە ، بەڵکو ئەحبارەکانمان نوسیویانە کە لە خوا ناترسن [٢]

جولەکە زۆرێ هەوڵی داوە بوونی ئەم پێغەمبەرە بباتەوە سەرخۆی، لەوەدا تەماحی هەبووە بەوەی ئەو پێغەمبەرە دەسەلاتی هەیە و دەبێتە خاوەن قەوارەیەکی پارێزەر و جیهانیانە . رۆژێك عیسا ( علیە السلام ) لە باسی ئیبراهیمدا دەفەرموێت کە ئیبراهیم خوای خۆشویست و خۆشەویستیەکەشی لە بت شکاندن و دوورکەوتنەوە نەبوو لە دایك و باوکی، بەڵکو خۆشەویستیەکەی لەوەدا بوو لەبەر گوێڕایەڵی خوای گەورە ویستی کوڕەکەی خۆی سەربڕێ ، گەورەی کاهینەکانیش بە توڕەییەوە دەڵێ کە کوڕەکەی ئیبراهیم کێ یە ؟ مەسیحیش وەڵامی دایەوە : راستی دەڵێم کە کوڕەکەی ئیسماعیلە و لە نەوەی ئەو، ئەو پێغەمبەرە دێ کە ئیبراهیم مژدەی داوە و هەموو هۆزەکانی زەوی پێی گەورە دەبن، گەورەی کاهینەکان لە بیستنی ئەو قسانەدا هاواریکرد با ئەم خراپەکارە بەرد باران بکەین کە سوکایەتی بە موسا و شەریعەتەکەی خوای کرد ، ئەمە ئیسماعیلیە [٣]

---

[٢] ئینجیلی بەرنابا ، بەشی چل و چوار ، لا ٦٨

[٣] ئینجیلی بەرنابا ، لا ٢٠١ ، لا ١٨٨

مەسیح ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) ئامۆژگاری خوێندکارەکانی دەکات کە راستی وەربگرن و شوێنی بکەون ، ئەندرواس دەپرسێ : ئاخۆ چۆن راستی بناسینەوە ؟

مەسیح دەفەرموویت : ئەوەی لەگەڵ پەرتووکەکەی موسادا رێک دێت وەربگرن، لەبەر ئەوەی خوا یەکە راستیش هەر یەکە و لەوەشدا یەك پەیام هەیە، گەر یەك پەیام بوو ئەوا باوەڕیش یەکێکە، راستیتان پێ دەڵێم : گەر کتێبە راستیەکەی موسا نەسڕابایەتەوە ئەوا خوای گەورە دووەمین کتێبی بە داودی باوکمان نەدەنارد، گەر کتێبەکەی داودیش دەستکاری نەکرابا ئەوا ئەم ئینجیلەی بۆ من نەدەنارد، خوای هەموومان یەکە و ناگۆڕێ، یەك پەیامی بۆهەموو مرۆڤایەتی ناردووە، هەرچ کاتێ پێغەمبەری خوا هات ، ئەوا بۆ ئەوەدێ ئەو هەموو شتانە پاك بکاتەوە کە لە پەرتووکەکەی مندا شوێندراوە [1]

کە خوا یەکە و یەك پەیامیشی هەیە، سەرچاوەی ئەو راستیە درکاندنەیەکە نەجاشی پادشای حەبەشە لە جەعفەر دەبیسێت سەبارەت بە عیسا ( علیە السلام ) و داواکردنی پەیامی نوێ لە تەنیا پەرستنی خوا و دوورکەوتنەوە لە دزی و کوشتن و خراپەکاری و پێداگرتن لەسەر کاری چاك و بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی و ستەم نەکردن لە ئافرەت، نەجاشی دەڵێ : سوێند بەخوا ئەم پەیامە و ئەو پەیامەش کە عیسا هێناویتی سەرچاوەکەیان یەك شتە ، ئەوەش درکاندنی ئەو راستیەیە کە کەسانی دیکە لە جولەکە و گاورەکان نکۆڵیان لێ کردووە، زۆرێك خراپە کاریش بەرامبەر بە عیسا ( علیە السلام ) هەربۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئاشکرای کردووە پێغەمبەری دوایین لە نەوەی داود نیە

---

[1] ئینجیلی بەرنابا ، لا ١٨٨ .

له تەوراتی عیبرانی و ئەسحاحی سێ یەمدا و له سفری ( حبقوق ) دا هاتووه : ( زەوی له سوپاسکردنی ئەحمەددا تێر بوو، دەسەڵات و پادشایەتیەکی هەیە کە گەردنی ئوممەتانی لە دەستدایه ) [٢]

له چاپی لەندەنی ساڵی ١٨٤٨ ز و چاپکراوێکی دیکەی بەیروتی ساڵی ١٨٨٤ ز و چاپێکی کۆنی سفر ( حبقوق ) دا لەو پەڕی رونیدا دەبینین کە هاتووه : ئاسمان لە جوانی موحەممەددا رووناك بوویەوه ، زەوی لە سوپاسکردنیدا تێر بوو، ناوت لە رۆژگاردایە، دەنگت لە دەریادایە، ئەی موحەممەد سوپاس بکە، بێگومان چیاکان تۆیان بینی لەرزینەوه [٣]

ئەو مژدانە باسکردنی تەواوی موحەممەدی پێغەمبەرن ( صلی الله علیه وسلم )، لە ئینجیلی (یوحنا) شدا هاتووه کە مەسیح ( علیه السلام ) دەفەرمووێت : گەر منتان خۆشدەوێ راسپاردەکانم بپارێزن، من لە باوك داوا دەکەم کە ( روح الحق ) [٤] تان بۆ بنێرێ تا لەگەڵتاندا بمێنێتەوه بۆ هەتا هەتایی [٥] ، هەروەها هاتووه کە زۆرتان لەگەڵدات ناڵێم، چونکە سەرۆکی ئەم جیهانە بۆخۆی دێت کە هیچ شتێك نیه لە مندا هی ئەو بێت [٦] . ئەوەش بۆخۆی روونە کە دوای عیسا موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) بە پێغەمبەرێکی دەستپاکانە هاتووه و پەیامەکەی جیهانیه، ئەوەشی کە عیسا دەفەرمووێ بۆ هەتا هەتایی تیاتاندا دەمێنێتەوه بەڵگەی کۆتا پێغەمبەری و کۆتا پەیامێکی ئاسمانیە کە خوای گەورە دەینێرێ،

---

[٢] بڕوانه : الهدایه الحیاری فی أجوبه الیهود والنصاری .

[٣] هەمان سەرچاوه .

[٤] روح الحق : له عەرەبییەکەدا هاتووه و دەڵێن له ئینجیلی یۆنانیشدا به ( بارقلیت ) هاتووه کە تەواوی واتای موحەممەده – نوسەر .

[٥] یوحنا : ١٥:٢٥ ، ٣١

[٦] هەمان سەرچاوه

یان دەفەرمووێ : ( جا کەی ئەو پێغەمبەرە کە من لە لایەن باوکەوە دەینێرم بۆلاتان ، ئەو دەم شایەتی بۆ من دەدات ) [٧]

بە تەماشا کردنمان بۆ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) زۆرێك بەڵگەی گەورەیی و راسپاردەکانی عیسای پێغەمبەر دەبینین سەلامی خوای لەسەر بێ، عیسا دەفەرمووێ :

( بەڵام من حەقیقەتتان پێ دەڵێم، ئەو کەسە باشترە بۆ ئێوە لەوەی من لە نێوتاندا بڕۆم، چونکە گەر من دەرنەچم ئەم ( روح الحق ) ە نایەت، بەڵام من کە رۆیشتم ئەو دێت، ئەوەش هەرکەی هات جیهان بە شمشێر دادەپڵۆسێت لەسەر گوناه و تاوانێك ولەسەر خێر و چاکەیەك ولەسەر دادو لێپرسینەوە [٨] هەروەهادرێـژەی لەسـەر دەدات کـە گیانی حـەق سـەرۆکی ئـەم جیهانەیە و ئاینی خۆی هەیە، مـن کۆمەڵـە کاروبار و باسێکم لایـە نـاتوانن ئێوە بچنە ژێـری، بـەڵام کاتێك ئـەو ( روح الحق ) ە هـات ئـەو رێنـوێنی و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ هەموو راستیەك ، ئەو لە خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو هەرشتێك ی دەیبیستێت پێـی دەدوێـت و هـەواڵی کاروبـار گـەلێکی داهاتووتـان پـێ رادەگەیـەنێت، ئـەو کەسـە سـەربەرز و مـەزنم دەکـات، هەرچیم هەیـە بۆخۆی دەبات و وەری دەگرێت و هەواڵ بە ئێوە دەگەیەنێت [١]

ئەو وەسفەی عیسا ( علیه السلام ) کە روح الحق لە خۆیەوە نادوێ، واتای ئەو ئایەتە قورئانیەیە کە خوای گەورە لە وەسفی موحەممەدی پێغەمبەردا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووێت : (( وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى )).

---

[٧] ئینجیلی یۆحنا [ ع ١ : ع تاوەکو ١٥ ].

[٨] هەمان سەرچاوە .

[١] ئینجیلی یۆحنا [ ع ١ : ع تاوەکو ١٥ ].

دەرکەوتنی ئیسلام و هەڵوێستی ئەهلی کیتاب :

خوای گەورە گەردوون و ژیانی دروست کرد بە هەموو بونەوەرەکانەوە، بە بێ ئەوەی پێویستی بە هاوکاری و یارمەتی دان هەبێ، خۆی زانا و شارەزای شتە نادیارەکانە، مرۆڤ و جنۆکەی دروست کرد تاوەکو هەر خۆی بپەرستن و یەکتا پەرستی بۆ بسەلمێنن، هەروەکو دەفەرمووێت :

((وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ )) [٢]

واتا :.مرۆڤ و جنۆکەم دروست کرد تاوەکو تەنیا بە مەبەستی پەرستن .

سەرەتای مرۆڤایەتی لە ئادەمەوە شارەزا بە پەرستنی خوا بووە، پاشان لادان لە شێرازەی خوا پەرستی مرۆڤدا روویداوە و خوای گەورەش پەیامی ڕیاکەرەوەی خۆی بۆ پەیامبەرەکانی ناردووە، نەتەوەکانیش هەیانبووە هەر لە ژیانی پێغەمبەرەکاندا دەستبەرداری ویستی خراپەکاری خۆیان نەبوونە، بەڵکو زیاتر سوور و پێداگر بوونە لە زیاتر کردنیدا

نەتەوە و میللەتانیش هەبوونە پەیامی خوا کاری تێکردوون و لە تاوانکاری پاشگەزبوونەتەوە، بەڵام بە تێپەڕبوونی ماوە و لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ گەڕاونەتەوە بۆ بە خووکردنی ئەو نەریتە شەیتانیانە، مرۆڤ ناتوانێ لە وەها دۆخێکدا ڕێز و حورمەتی خۆی بپارێزێ و ناچار نەبێ ببێتە کۆیلەی تاغووت و دیکتاتۆری سەردەمەکەی، بۆیە لە وەها دۆخێکدا شەرمەزاریانە لە مێژوودا دەبینرێت، لە پێش دەرکەوتنی ئیسلامدا وڵاتی عەرەب و جیهان بە گشتی لە وەهاحاڵەتێکی سەرگەردانیدا دەبێ، خوای گەورە پەیامی خۆی بۆ موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) دەنێرێ بۆ گەیاندنی بەخەڵکی بە تێکڕا،

---

[٢] سورەتی : الذاريات ، ئایەتی ٥٦

قورئانیش زۆرێك رووبەڕووی بانگەشە کارانی جولەکە و گاور دەبێتەوە کە لە بانگـەوازی پێغەمبەرانیانـدا ئامـاژەی روون هەیـە بـە شـوێنکەوتنی کۆتـا پێغەمبەری خوا لەسەر زەویدا، هـەروەکو لـە ئینجیلـی یۆحنادا هاتووە ( من داوا لە باوکم دەکەم کە پەیامبەرێکی ( معزیاً اخر ) بۆ بنێرێ تاوەکو بۆ هەتا هەتایی لە گەڵتاندا بمێنێتەوە ) [٢]

خـوای گـەورە رایگەیانـدووە کـە پێغەمبـەرەکانی بـۆ یـەك ئامـانج هـاتوون و بانگەوازیان کردووە، کە تەنیا پەرستنی خوا و نەهێشتنی ستەم وبە کۆیلە کردنە، پێغەمبەری ئیسلامیش ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووێت :

(الأنبیاء إخوة و دینهم واحد).واتا: پێغەمبەران برانوئاینەکەشیان یەك ئاینە

کە موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) هات بێ باوەڕی و هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا جێگای یەکتاداناني خوای گرتبوویەوە و باوەڕێکی کار لەسەر کراو بوو، گەرچی باوەڕەکە بت پەرستی بووبێ یان خیانەتی جولەکە و سێ گیانەیی گاورەکان و داریەرستنی عەرەب، هەروەکو موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت : ( اللهم اني أول من أحیا امرك إذا ما أماتوه )، واتـا : خوایـە مـن یەکـەمین کەسـێکم ئـەو پەیامـەت زینـدوو بکەمـەوە کـە مراندبوویان .

پـەیامی یەکتاپەرسـتی تووشـی ئـەو شێواندنە بوویـەوە کە جولەکە سیفەتی ناتـەواوی دەدایە پـاڵ خـوا و گـاوریش ( نـصاری ) لـە جیاتی خوا پەرستی، عیسا ( علیه السلام ) یان کردە خوا و بوونە خاچ پەرست، ئیسلام هـات رووی راستەقینەی خواناسـی خستە روو، ئیسلام لە مەککە و لانکەی پەرستنەکانی ئیسماعیلی پێغەمبەر ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) دەرکەوت،

---

[٢] ئینجیلی یۆحنا ( ١٤ : ١٦ ) .

موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) بە خۆی و هاوەڵانیەوە سیانزە ساڵ لەوێدا خەڵکیان بانگەواز دەکرد بۆ یەکتاپەرستی و دانەوی مافەکان و دورکەوتنەوە لە دیمەنە دژە مرۆییەکان، لەو کاتەدا ئەهلی کیتاب لە جولەکە و نەسرانیەکان باش دەیانزانی کە پێغەمبەرێکی موژدە پێدراو و ناسراو لە کتێبەکانیاندا دەرکەوتووە و بانگەواز بۆ پەرستنی خوا دەکات، پێشتر لە کاروباری مەککەیان دەپرسی و بە شوێن سیفەت و رەچەڵەکیدا دەگەڕان، بە تایبەت جولەکەکانی شاری مەدینە بە بوون و دەرکەوتنی وەها پێغەمبەرێك هەڕەشەی هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەجیان دەکرد، بەوەی ئەو پێغەمبەرە دەرکەوت ئەوان دەکوژن، بەڵام لە دەرکەوتنیدا پێچەوانە هەنگاویان هەڵگرت، هەروەکو چۆن بەرامبەر بە عیسا ( علیه السلام ) بوونەوە، لەگەڵ هاوبەش پەیداکارانی عەرەب رێککەوتن بۆ کوشتنی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) و بۆ هەتا هەتایی کپ کردنەوەی بانگەوازەکە، تانەیان لێ دەدا کە فریو دەرە نەك پەیامبەر، بۆیە خوای گەورە لە قورئاندا سەرزەنشتیان دەکات و لە بارەیانەوە دەفەرموێت : (( وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ ))[1]

واتا:ئەوان لە پێشوتردا دژی ئەوانەی کوفریان دەکرد بەوەی لە کتێبەکەیاندا هاتووە هەڕەشەی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد، بەڵام کە پێغەمبەرەکە هات کە لە ئەوانیشدا باسی هاتووە دژی وەستانەوە و بێ باوەڕیان بەرامبەر نواند، نەفرەتی خواش بۆ بێ باوەڕان بێ

دەیانزانی ئەو بانگەوازەی کە موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) دەیکات، هەمان ئەو بانگەوازەیە کە لە تەورات وئینجیلدا هەیە، خوای گەورەش

---

[1] سورەتی : البقرة ، ئایەتی ٨٩ .

دەفەرمووێت: (( وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَقَفَّيْنَا مِن بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ أَفَكُلَّمَا جَاءكُمْ رَسُولٌ بِمَا لاَ تَهْوَى أَنفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقاً كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقاً تَقْتُلُونَ ))[٢]

واتا : سوێند بە خوا ئێمە کتێبی تەوراتمان بە موسا و دوای ئەویش پەیتا پەیتا پەیامبەرانمان ناردووە چەند بەڵگە و موعجیزەیەکی رونیشمان بە عیسای کوڕی مەریم دا تا پەیامبەرێتی خۆی بسەلمێنێ و بە فریشتەی سروشتیش پشتیوانیمان لێ کرد، کەچی ئەنجامی ناردنی ئەو پەیامبەرانە، هەر ئەمە بوو کەی ئەمە راست و رەوایە، هەتا ئێستاش هەر کات پەیامبەرێکتان بۆ هاتبێ کە پەیامەکەی لەگەڵ هەوا وئارەزووی ئێوەدا نەگونجابێ نارەزایتان دەربڕیوە و و تەکەبورتان بەسەریاندا کردووە و باوەڕتان نەهێناوە، ئەوساش بوونە دوو دەستەوە : دەستەیەکتان باوەڕتان پێ نەکرد و بەدرۆتان خستەوە وەکو عیسا و موحەممەد - سەلامی خوایان لەسەر بێ - دەسەیەکی تریشتان کوشتن وەکو ( زەکەریا و یەحیا و ئەشعیا ) سەلامی خوایان لەسەر بێ .

هەروەها دەفەرمووێت : (( الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمُ الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ ))[٣].

واتا : ئەو جولەکە وگاورانەی کتیب ونامەمان پیداون، هەروەکو کوڕەکانی خۆیان دەناسن، ئاواش موحەممەدی پەیامبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەناسن، چونکە لە تەورات و ئینجیلدا سیفەتە بەرز و جوانەکانی هاتووە و بە ئاگایشن لێی، ئەو کەسانەی زیانیان لە خۆیان دا بە هەڵبژاردنی رێگا چەوتەکان ئیتر باوەڕ ناهێنن بە موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) چونکە هەر خەریکی ململانێ و سەرپێچی خۆیانن .

---

[٢] سورەتی : البقرة ، ئایەتی ٨٧ .

[٣] سورەتی : الانعام ، ئایەتی ٢٠ .

زانا جولەکە و گاورەکان ( ئەحبار و راهیبەکان ) بۆیان نەگونجاو بوو باوەڕ بە بانگەوازی راستەقینە بهێنن کە تەواوکەری ئاینە ئاسمانییەکانی ترە، چونکە باوەڕهێنانیان واتای کۆتایی هاتنی بەرژەوەندی مادی و گەورە نواندنیانە بەسەر خەڵکیدا و لە مێژەشە ئاینەکانی خۆیان داهاتێکی باشی بۆ دەستەبەر کردبوون، خۆیانیان لە حەقیقەتی ئەو پەیامە بێ ئاگا کرد کە مەبەست لێ ی بەدیهاتنی یەکسانی و دادپەروەریە .

ئەحمەد دیدات لە بارەی پلە و پایەی مەسیح لە ئیسلامدا دەدوێت و دەپرسێ: ئاخۆ موسوڵمانان کە جوان و دڵسۆزانە لە بارەی مەسیحەوە دەدوێن هەوڵی هەڵخەڵەتاندنی مەسیحیەکانە ؟ نەخێر هیچ وانیە، بەڵکو ئەوان

( موسڵمانان )تەنیا ئەوە روون دەکەنەوە کە لەلایەن خواوە فرمانیان پێ کراوە، لەوەدا هیچ دەستوەردانێکیان بۆ نیە، ئەوە دەڵێن کە لە قورئاندا هاتووە، هەروەها دەڵێت : ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە کە عیسا یەکێکە لە گەورە پێغەمبەرانی خوا، مەسیحی راستەقینەیە، لە راستیدا موسڵمان بە موسڵمان نازاندرێت گەر باوەڕی بە عیسا ( علیه السلام ) نەبێ [1]

لە ئیسلامدا گشت گەورەییەکی پێغەمبەران باس کراوە، تۆمەتیان لەسەر لا دراوە و پایەی مریم ( علیها السلام ) گەورە راگیراوە و باس لە هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەران کراوە و باوەڕدارانیش هاندراون بۆ خۆ جوان کردن بە ژیانی ئەوان و پێشەنگ کردنیان و راگەیاندنی بەوەی باوەڕهێنان بە موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) وەك پێغەمبەر بەبێ باوەڕبوون بە پێغەمبەرانی تر باوەڕێکی ناتەواوە ، ئەوان بۆ چەسپاندنی وەحدانیەتی خوا و شەریعەتەکەی بانگەوازیان کردووە .

---

[1] احمد دیدات : منزلة المسیح في الاسلام و محاورة مع المسیحیین حول الوهیة المسیح :/ ، علی الجوهری کردوویەتی بە عارەبی ، لا ٨ ، دارالفضیلة ، ١٩٩٠

# تەوەری دووەم

## ململانێ و پاساوەکان

بەشی یەکەم / ململانێ ی ئەخلاقی.

بەشی دووەم / ململانێ ی فیکری

بەشی سێ یەم / ململانێ ی دەسەڵات

بەشی چوارەم / کێشەی فەلەستین و دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل

بەشی پێنجەم / زیندوویەتی ئیسلام و تەوەری هێرش کردنە سەری .

# بەشی یەکەم

## ململانێ ی ئەخلاقی .

### باسی یەکەم / ململانێ ی ئەخلاقی ، بۆچی ؟

### باسی دووەم / کەرەستە و ئامرازەکانی ململانێ ی ئەخلاقی

## یەکەم / ململانیٚ ی ئەخلاقی ، بۆچی ؟

دیارە سنوری ئەخلاقی بەرفراوانە، لە هەڵس و کەوت و تێڕوانینی تاك بەرامبەر خۆی و خەڵکی ڕەنگدەداتەوە و تاوەکو دەبێتە دیاردە، پلە بەرزی تاك و کۆمەڵگاکان لە جوانی و سەنگینی ئەخلاقدا دەردەکەوێت ، ئەخلاق پێش هەموو شت دیاریەکی خواییە بۆ مرۆۋ . بۆ پەسەند کردن و راییکردنی رەوشتە جوانەکان ژیری و خۆرسکی مرۆڤانەی پیٚ بەخشیوە .

ئەو ئاینانەش کە لەم میانەیەدا باسیان لە بارەوە دەکەین، هۆی هاتنیان بۆ بەرپاکردنی دادگەری و بلاٌوکردنەوەی رێز لە نێو کۆمەڵگە و هەست کردنی تاك بووە بە بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر ماف کەسانی دیکەدا، هەروەها ساغ پەروەردە کردنی نەوەکان بووە تاوەکو هەڵبژاردەیەکی ئەخلاقی و نمونەیەکی گەورەی خووڕەوشتی ساغ بن، لەوەشدا گیانی هاوکاری و دڵنیایی لە کۆمەڵگەدا ریشکە بکوتیٚ، بەلاٌم لادانی شوێنکەوتووانی ئاینەکە و لە سەروی گشتیەوە ئەو گۆڕانکاریەی لە تەورات و ئینجیلدا هاتە کایەوە دیاردە نا ئەخلاقیەکان زیاتر بوونەوە، بیری وەهمی و ئەفسانە و وتەی بیٚ باوەڕیانە هاتنە ئاراوە و جیٚ ی پەیامە راستەقینەکەیان گرتەوە، هۆکاری ئەو گۆڕانەش گەڕان بوو بە دوای پاساودانی کارە خراپەکانی بە ناو راپەرێنەرانی ئاین و تۆمەت خستنە پالٌ پێغەمبەران کە لە پێناو بەختەوەری مرۆڤایەتیدا چەرمەسەری زۆریان چەشتوو شەریعەتی خوایان لە نێو خەڵکیدا بلاٌو دەکردەوە، لوت ی پێغەمبەریان بە زیناکار لە تەك کچەکانیدا و مەریەمیشیان بە زیناکار و داودی پێغەمبەر ( سلاٌوی خوا لە هەموویان بیٚ ) بە ئارەزووباز تاوانبار کرد، ئەو وتە نابەجێیانەش خزێنرانە نێو تەوراتەوە بەو پیٚ یە ی خوای گەورە وەهای وتووە ( پاك و بیٚ گەردی بۆ خوا )

نەسرانیەت و جولەکەیی کە دوو ئاینی جولەکەکان بوونە، کە دەرچوون شیرازەی راستەقینەی ئاینەکە هاتە بوون، بوونە دورترین ئاین لە راستەقینەیی ئاینی ئاسمانی و خەڵکیش وەکو ئەوان ( گەورە ئاینزاکان ) دیاردە نا ئەخلاقیەکانیان بە کارکرد و تاکە ڕێگەیەکی خۆ رزگارکردن لە بەرامبەر داپڵۆسێنەری گەورەکاندا تەنیا گرنگی خستنە سەرداتەپینی ئەخلاقی بوو

مامۆستای شەهید سەید قوتب ( بە رەحمەت بێ ) دەڵێت : کڵێسا دوای ئەوەی خەڵکی لە سەردەمی رێنسانس و سەردەمی فەلسەفەی مادی لێ ی رەرینەوە و دورکەوتنەوە، تاڵاوی پەراوێزی و نارەحەتی دوور بوونی لە ژیانی کۆمەڵگە چەشت، نەریتی گرت بە دوای کۆمەڵگەوە لە راکردندا بێت و بە دوای ویست و ئاواتی خەڵکیەوە بێ، نەك بۆ ئەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵگە بکات و خەڵکی بۆلای ئاین بگەڕێنێتەوە، نەخێر تەنیا بۆ ئەوە بوو لە دوای خەڵکیەوە بێ، بۆ ئەوەش کە ئارەزووی خەڵکی بهێنێتەوە لای ئاینەکە ، لە کڵێساکاندا – دوای قداسەتکردن ئاهەنگی تێکەڵی دەبەست تاوەکو عەرەقی تیادا بخورێتەوە و سەما و یاری تیادا بکرێت، کچ و کوڕە سەرخۆشەکان باوەشیان بەیەکدا دەکرد و تاوەکو بەیانی بوونەوە بەدەم سەماوە یەکیان دەگوشی هەر ئەو کارانەش بۆ راکێشانی گەنجەکان بوو بۆلای ئاین [1]

دەکرێت وەرچەرخانێکی لەو جۆرە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنێکی جدییانەی بۆ بکرێت، کڵێسا کە خۆی بە خاوەنی ئاینی نەسرانیەت دەزانێ و قەشە و کاتدرائیەکانی بڕیاردەرن، مامەڵەی نەشیاویان و بوارکردنەوە بە کارە دزێوەکان وەکو بەدەمەوە هاتنی شەهوەتی سێکسی و عەرەق

---

[1] سید قطب : الاسلام و مشكلات الحضارة ، لا ٧٩

خواردنەوە وەکو ئەوەی ئینجیل شانازی پێوە دەکات کەعیسا (علیه السلام) لە پڕ کردنی چەند کوپێکی عەرەق لە قانای جەلیل بە یەکێك لە موعجیزەی پێغەمبەرایەتی خۆی پیشان داوە، پاشان بونیاتە ناتەواوەکەی ئاین و ژێری نەسەلماندنی و نەبوونی وەلآمی عەقڵیانە بۆ پرسیارەکانی مرۆڤ، هەموو هۆکار بوون بۆ زەقبوونی ئەو دیاردە نا ئەخلاقیانە

رووت و قووتی و رەگەزبازی کە دەرچوونن لە شیرازەی ئەخلاقیانەی مرۆڤ، ئەو مەترسیانەن کە پێغەمبەران لە بانگەوازەکانیاندا جەختیان لەسەر کردۆتەوە و زۆرجاریش مایەی لە نێو بردن و لە نێو چوونی میللەتان بووە، کەچی باسێکی لەو جۆرە لە بنەماکانی ئەو ئاینانانەدا ( مەسیح و یەهودییەت ) نیە، بەڵکو ئەوان زۆر بێ رەحمانە دەڕواننە ئافرەت، ئافرەت لای ئەوان تەنیا بۆ بەدیهێنانی ویستی شەهوەتبازی پیاوان بووە و پیاو وەکو خوای بووە، لێرەدا شۆڕشێك دروست بووە کە لە ئەنجامیدا شەهوەت و ئارەزووی خراپەکاری بووەتە شالآوی بەر تەسکردنەوەی کایگەری ئاین، کەچی پیاوە ئاینیەکانی مەسیحیەت بە وەها حاڵەتێك سەخت نەبووەنە و بوونی متمانەی باوەڕی بە خاچ و گیان فیدایی مەسیح بۆ ئەوان رزگاربوونە لە هەر کارێکی قێزەون، گەرچی زۆریش گەورە بێ. ئەم بنەما باوەڕییە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە زیاتر سڕینەوەی مۆرکی ئاینێکی ئاسمانی و نزیکبوونەوە لەو رێبازە زەمینیانەی کە لە خۆیاندا پیرۆزییەکیان بۆ خێزان و بنەماکانی هەڵنەگرتووە، شانازی ئەو ئاینانە لە بوونی خاچێك لە ملدایە، ئەگەرچی هەڵگری خاچ دزی گەورە و شەرواڵ پیس و خووگر بە بارەکان بێ.

د. موحسین عەبدولحەمید لە نامیلکەی ( الیهود و تفجیر الجنس ) حاڵەتێکی کلێسا دەگێڕێتەوە کە جارێك لە پاریس لەبەردەم کلێسایەکدا کە بووەتە شوێنی گەشتیاری و کوڕ وکچە رووتەکان قەرەبالغیان لێ کردووە، قەشەیەك لێ ی نزیك دەبێتەوە و لە تەکیدا دەکەوێتە گفتوگۆ.

له یەکێك له پرسیارەکاندا د   موحسین لێ ی دەپرسێ : ئاخۆ کاریگەری ئاین له وەها کۆمەڵگەیەکدا چیه و چۆنه ؟ قەشەکەش بۆ وەڵامی ئەو پرسیاره ئاماژه دەکاته کچ و کوڕه دەست له ملەکان !

بڵاوبوونەوەی خراپەکاری لە نێو کۆمەڵگەکاندا دەکرێت هەبێ، سروشتی مرۆڤەکان وەکو ئەوەی ئارەزووی تیادایه و زۆرجاریش ئەو ئارەزووه پەل و پۆ هاوێژی هەیه بۆ ویسته خراپەکان، هەر لەبەر ئەو کارەشە پێغەمبەران پەیامیان بە مرۆڤەکان گەیاندووه، تاوان له پێناسه شەرعیەکاندا بوارێکی بەرفراوانی هەیه، شته مادی و مەعنەویه حەرامکراوه خواییەکان دەگەیەنێ، بابەته ئەخلاقیەکان یەکێکه له بواره هەره جەختکراوەکانی ئاین،باوەربۆمرۆڤ ریشەو بناغەیه،ئەخلاق وداد دەبێتە بەرهەمی، سفوری و شەهوەتبازی و ئەوخراپەکاریانەی دیکه که لەژیانی کۆمەڵگەی رۆژئاوادا دەبینرێت زیاتر له خوڕەوشتی ئاژەڵانەوه نزیکە، چونکه مرۆڤ لە سایەی خێزاندا لە کۆنەوه وەکو خۆرسك خۆی دۆزیوەتەوه، ئەدای ئاینی لە کۆمەڵگەدا نابێ بپڕدرێت، رووپامایی له ئەدادا نیه، پێویسته ئاین وەزیفەی خۆی بگەیەنێ، نەکەوێته شوێن واقیعێك که ئارەزووی خەڵکی دیکه واقیعەکەی لەو بارەدا بردبێت، زەمەن واقیعەکەیه، هەروەکو ئیسلام نەهی کردووه لەوەی جنێو و قسەی ناشیاو به زەمەن بدرێت، زەمەن یەك شته، بەڵام سروشتی مرۆڤەکانی هەر زەمەنێکی دی جیاوازه، هەروەکو شاعیر دەڵێ :

نعیب زماننا والعیب فینا

ومالزماننا عیبٌ سوانا

واتا : توانج و ناتەواوی لە زەمەنی خۆمان دەگرین لەسەر ئەو نارێکییەی هەیه، کەچی ناتەواوییەکه له ئێمەی مرۆڤدایه، بەراستی زەمەن بێ لەکەیه و ناتەواوی له ئێمەدایه نەوەك شتی تر .

ناتەواوی لە ئەدای ئایندایە، بۆیە وەها ناتەواویەك روو دەكاتە کۆمەڵگە، ئەدای ئاینی لە کۆمەڵگەی مەسیحی نشیندا کە پێناسێکی تەواوی بۆ خوا نیە و پاداشت و سزای دوای مردن لە سەر سێ گیانی (عقیدة التثلیث) بەندەبێ، هەردەبێ وەها مرۆڤ گەلێك بخولقێنێ کە ژیانێك بۆ خۆ دروست بکەن رێز و شکوێ و مرۆڤایەتی تیادا ئەتککراوبێ

ئاین دەبێ ( ثوابت ) نەگۆڕ و( متغیرات ) ی گۆڕاوی تیادابێ . گۆڕاوەکان، ئەو بوارەی ئاین رێگەی داوە لە گۆڕینی هەلومەرجی ژیان، حاڵەتی کت و پڕ وبار سەختی کاری لەسەر بکرێت، ئەم بوارە لە ئیسلامدا جەختکراوەیە، لە ئیسلامدا هەردوو بوارەکە هەیە، ( ثوابت ) نەگۆڕەکان مرۆڤی ئایندار دروست دەکەن، لە هەر سەردەمێکدا بژیت، دواکەوتوویی بێت یان پێشکەوتوویی، بنەماکانی ئیسلام یەك شتە و لە ئاینەکەدا هیچ شتێك بە جێ نەهێڵراوە

ئەخلاق لە ئیسلامدا بە تەواوێتی ئایندارى و باوەڕ پێناس کراوە، هەروەکو موحەممەدی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : (( اكمل المؤمنين إيماناً احسنهم اخلاقاً )).

واتا : تەواوترین باوەڕێکی ئیمانداران، ئەوانەن کە جوانترین رەوشتیان هەیە یان دەفەرمووێت : (( إنما بعث لأتمم مكارم الأخلاق )) .

موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : من تەنیا بۆ ئەوە نێردراوم کە خوورەوشتە جوانەکان رێك و تەواو بکەم .

ئەمەیە ئەدای جوانی ئاین بۆ ژیانی مرۆڤ، بنەماکانی ئاین دەبێ لە رووی رەوشتیەوە مرۆڤ دروست بکات، رەوشتێکی ساغ و دامەزراوی بۆ فەراهەم بهێنێ، ئەگینا بوونی پەیوەندی ناشەرعی و دزی و کاولکاری پێوستی بە رەوشتێك نیە، کەچی شوێنکەوتووانی ئاینی مەسیحیەت ( یاخود دام و دەزگا مەسیحی و یەهودییەکانی جیهان ) بەردەوام لە هەوڵداندان بۆ سەراپاکردنی ئەو دیاردەیە و داڕنینی ژیانی سەربەستانەی رێز و شکۆ و، بڵاوکردنەوەی بیرێکی قێزەون کە لەسەر ناشیرینکردنی خێزان

و پەیوەندی ناشەرعی و خیانەت دەوەشێتەوە، لە بەرامبەردا ئیسلام کە ئێستا لە دامەزراوە دەوڵەتیەکاندا غیابی پێ کراوە، پێش هەزار و چوار سەد ساڵە و وەکو تەواوکردنی ئاینە راستەقینەکانی پێش خۆی وریایی لە کاری داوێن پیسی و چەپەڵی داوە و رەوشتێکی گەورە و پیرۆزی لە خۆیدا هەڵگرتووە بۆ مرۆڤەکان بە تێکڕا، رازی دڵ و قسەی زمان و کاری ئەندامەکان بە سیما و کردارە وە پێکەوە گرێدراوە .

لە تەلموودا هاتووە کە خوای گەورە لە تاوانی ئەو جولەکەیە خۆش نابێ کە ماڵی ونبووی جوییم ( غەیرە جولەکە ) بگەڕێنێتەوە [1]

راستەقینە ئەوەیە کە ئاینەکەی موسا و عیسا ( علیهما السلام ) بۆ جوولەکە بووە، بەڵام فرمانی پێغەمبەران و پەیامە خواییەکان هەمیشە جەخت دەکەنەوە لەسەر گشتگیری رەوشت و جوان راپەڕاندنی بنەماکانی و بە هەڵسوکەوت کردنی لەتەك هەموو مرۆڤەکاندا، خەڵکانی جگە لە خۆیان بۆچی دەبێ بکەونە بەر مامەڵەی نەشیاو، تەنانەت تاوەکو ئەو ئاستەی ماڵی ونبووی کە مافێکی رەوای خۆیەتی لێی بشاردرێتەوە و گەر جولەکەیەکیش ئەو مافەی بۆ گەڕاندەوە کە ئەخلاق جوانی و سەدای ویژدان ئەوەی لێ دەخوازێ، ئەو کارەی بۆ بێتە تاوان و خوایش لێی نەبووریێ ؟ !! پێچەوانە تەواوترە، ئەوەی حەزی نیە بە گەڕانەوەی مافەکان هەر ئەو شەیتانەیە کە سامری و هاوشێوەکانی لە خشتەبرد و گوێرەکەیان بە خوا کرد و لە حەزی ئەو شەیتانەیە کە سواری سەریان بوو نارەحەتیان بۆ موسا و هارون وتەواوی پێغەمبەران دروست کرد و بوونە بەرژەوەندی پەرست

بۆیە کار و قسەیەکی لەو شێوەیە جێ ی سەیر نیە، ئەوان بەرامبەر بە پێغەمبەران وپیاو چاکەکانی خۆیان بە ویژدان نەبوون، ئەی بەرامبەر کەسانی بێگانە و خزمەتکارەکانیان چی !!

---

[1] ا . د : مصطفى مسلم : معالم قرآنية في الصراع مع اليهود ، لا ١٣٧ ، ط ٢ ، دار القلم – دمشق ١٤٢٠ هـ – ١٩٩٩ م.

غوفرانی خاچیش که لای مەسیحیەکان پیرۆزە و پاساو دەری دزی و شەروالْ پیسی بووە، بوویە جێی ئارەزووی جەنگی خاچ پەرستی بەسەر زەوی موسڵمانان کە رێز و باوەڕ و ئەخلاق جوانی لە بنەمای ئاینەکەیانە .

د . قاسم عبدە قاسم دەڵێ : ( غوفرانی صلیبی ) بەو پێ یەی پەرەسەندنی سیستەمی کڵێسا بوو بۆ سڕینەوەی ئەو تاوانانەی تاکی کاسۆلیکی ئەنجامیدابوو، بەسەر سێ قۆناغ دەوەستایەوە، دانپێدانان، ڕەزامەندی و بەرژەوەندی بوو ( واتا گەڕانەوە بۆ کۆمەڵی مەسیحی.....

پاشان تێ گەیشتنی کڵێسا لەم بابەتە زیاتر پەرەیسەند، بە جۆرێ لەسەر تاوانکاری مەسیحی کاسۆلیکی پێویست کرا بۆ سڕینەوەی تاوانەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر بە کارگەلێکی دلڕەقانە هەستێ

جگە لەوەش پیاوانی کڵێسا خزمەتێکی زۆری دەرەبەگ و سیکۆلارەکانی کردووە، ئەو کارانەش کڵێسای لە زۆرێك وەزیفەی رووحی دوورخستۆتەوە، هەر ئەو کارانە بووە یۆحەنای دووەمی لە ساڵی ٩٥٥ – ٩٦٤ خستۆتە بەد ڕەوشتیەوە کە لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا پاپا بووە، ( لوید براند ) ی ئەسقەمی کریمۆنیش دەڵێ : پاپا بەهۆی زیادە ڕۆی سێکسیەوە لەتەك یەکێك لە دڵدارەکانیدا مردووە [1]

هەر لەم سەردەمەشدا بەهۆی تەشەنە سەندی کاری بەدڕەوشتی لە نێو خودێ راهیب و قەشەکاندا، لەلایەن دام و دەزگا مەسیحیەکان و خودی پاپاشەوە پێوانە کراون، راپۆرتەکانی مەسیحیەت لە بارەی ئەو قەشانەوە ئەڵێن : ( کار ڕاپەڕێنەر و هەڵسوڕێنەرانی کڵێسا، کەسانێکن بەرگی پاکی ڕەهبانیەتیان پۆشیووە و دڵیان دڵی گورگە، کەسانێکن ڕاوی ئافرەتان دەکەن، گەرچی ئافرەتی کڵێساکانیش بێت .

ئەو راپۆرتە ڕۆژنامەی ( ناشیۆنال کاسۆلیك ریپۆرتر ) بڵاوی کردەوە کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەدەچێت و ڤاتیکانیش دانی بە

---

[1] قاسم عبده قاسم : ماهية الحروب الصليبية ، لا ٢٢ – ٧٨

ناوەڕۆکی ئەو هەواڵانەدا نا، راپۆرتەکە دەڵێت : قەشە و پیاوە ئاینیە گەورەکان ئافرەتە راهیبەکانیان لە خشتە بردووە بۆ کاری سێکسی، هەندێکیشیان زۆردارانە زۆریان لێ کراوە منداڵە ناشەرعیەکەی سکیان لە بار بەرن، رۆژنامەی ( ئەریبلیکا ) ی ئیتالیش دەڵێت : سەرەڕای ئەنجامدانی کاری سێکسی لەتەك هەندێك ئافرەتی راهیبەدا، زۆریان لێ کراوە حەپی دژە سك پڕی بخۆن

ئاژانسی هەواڵەکانی تەبشیریەتیش ( میسن ) ئیدانەی ئەم کارانەی کردووە و بە موبەشیرە بەد رەوشتەکان ناوی بردوون . رۆژنامەی ( ناشیۆنال کاسۆلیك ریپۆرتر ) ی هەفتانەیی دەڵێت : زۆر جار ئافرەتە راهیبەکان سکیان پڕ کراوە و پاشان سکەکانیان لەبار براوە، ئەم کارە نەك لە وڵاتێکدا روویدابێ، بەڵکو لە وڵات گەلێکی مەسیحی نشیندا روویداوە .

لە ئەفریقاشدا کە بە بیانووی کاری خزمەتگوزاری روو دەکەنە ئەو کیشوەرە و مەبەستیان بە گاور کردنە، بۆ ئەوەی لە سێکس کردندا تووشی ئایدز نەبن، لەگەڵ ئافرەتە ئەفریقیەکاندا سێکس ناکەن و سێکس لەتەك راهیبەکاندا ئەنجام دەدەن .

لادانە ئەخلاقیەکان لەوەدا نەماوەتەوە، بەڵکو پەنا براوەتە بەر نێربازی و بەکارهێنانی منداڵ، هەروەکو ( جیان مارملینسان ) بە پێنج ساڵ بەند کردن سزا درا کە کرداری سێکسی لەتەك منداڵەکانی کڵێسا ئەنجام دا بوو[1] .

ئەم رووداوە ئەخلاقیانە زۆرێك روویانداوە لە رابردوودا، ئێستاش زۆرێك روودەدەن و بەهۆیشیەوە راهیبە گەلێک لە کڵێسا دەرکراوە، بەهۆی ئەوەی زیادە رەوی زۆریان کردووە، ئەوەش بەرهەمی ئامۆژگاری کڵێسا و تەبشیریەتە، ئاخۆ گیرۆدە بووی نا ئەخلاقی دەکرێ چ پەیامێکی ئەخلاقی پێ بێت بۆ کەسانی دیکە !؟

---

[1] کاتێك گورگ دەبێتە شوانی مەڕ : و – عبداللە گەرمیانی ، گۆڤاری سروت ، ژ ٨ – ٩ ، ١٤٢٥ ك .

جولەکەکانیش باوەڕیان وەهایە کە داوێن پیسی لە نێو خۆیاندا حەرامە، چونکە گەلی هەڵبژێردراوی خوان ! بەرامبەر جگە لە خۆیان رێدراو یاخود سزای پاداشتی دوژمنکارانەیە بۆ جولەکە !
ململانێی رابردووشیان لەتەك پادشا و نەتەوەکاندا هەر بە هۆی کارە نائەخلاقیەکانەوە بووە، وەکو سوو خواردن و عەرەق خواردنەوە و داوێن پیسی و جوانکردن و رازاندنەوەی کچانی جولەکە بۆ پادشایان بەمەبەستی کاریگەری خستنە سەر و لێدانی نەتەوەکانی دیکە، زاناکانیشیان لایەنێکی دیکەی بڵاو کردنەوەی بیری خراپەکارین، وەکو نیتشە و دۆرکایم و سیجموند فرۆید و دەیانی دیکە .

کەرەستە و ئامرازەکانی ململانێی ئەخلاقی :

جولەکە لە پێناو دروست کردنی دەوڵەتەکەیان و بێ ئاگا کردنی گەلاندا، رێباز و شێوازی جۆراوجۆریان گرتۆتە بەر و دەیان رێگەیان تاقیکردۆتەوە، وا دەبینین کە شێوازەکانی دەسەڵات لە جیهاندا خراپە و پێویستە زیاتر خراپ بکرێت ، تاوەك ئەو کاتە دێت کە پادشانشینی جولەکە دروست دەبێ .
لە پرۆتۆکۆلیاَندا هاتووە : پێویستە بیرۆکەی خوا لە بیر و ژیری جگە لە جولەکە دەربکەین، لە جێگەیدا کاری ژماردن یان ئارەزووە ماددییەکان دابنێین [1]

ئەم پەیامی بێ ئاگای کردنە هەمان ئەو پەیامەیە کە کارل مارکسی جولەکە ئاینەکان بە تیلیاکی گەلان ناودەبات، ئەوانن ئاینیان بۆ خەڵکی بۆ ئەو مەبەستە دەوێ کە خەڵکی پێی بێ ئاگا بکەن، ئەوەتا هەر خودی مارکس شۆڕشێکی ماددیانەی خوڵقاند وەکو ئەوەی چینی چەوساوەی ژێر دەستەی قەیسەری مەسیحی پێی هەڵخەڵەتاند و پزشکی بیری ئەو و شوێنکەوتەکانی

---

[1] الرفاعي : حقيقة اليهود ، لا ٤ .

هەزاران مزگەوتی روخاند و وڵاتانی ژێر دسەڵاتی یەکێتی سۆڤیێتی کاول کرد و بە سەدان هەزار هەتیو و بێوەژن و قەتڵوعامی موسڵمانانی قەوقازی دروستکرد . ئاخۆ بیر و شۆڕشی مارکسی بەهەشتێکی هێنایە بوون ؟ ! جگە لە سەمەرە کردنە خەڵکی چەوساوە و بەدیهێنانی هەوەسبازی خۆیان [٢] ، جولەکەش لەوەدا سەرکەوتوو بوو .

لە ( دائرة المعارف اليهودية ) لە مادەی ماسۆنیەتدا هاتووە : کە بزوتنەوەی ماسۆنیەت بە نهێنیەکی هەمیشەیی داپۆشراوە و لە ناوەڕۆکدا دەقی گرتووە لەسەر پیرۆزکردنی سێکس و ئازادی تەواو لە بڵاوکردنەوەی بەرەڵڵایدا، ئومێدی ماسۆنیەکانیش لە رووی رەوشتی ژیانی خەڵکدا وەستاوەتە سەر رێکخستنی خەڵکانێك لەسەر جۆری رەوشت، کە لە کاری بەد رەوشتی و داوێن پیسیدا هەست بە شەرم ناکەن .

هەر بۆ ئەم مەبەستەشە بۆ وێرانکردنی کۆمەڵگەی موسڵمانان دەیان کەناڵی سێکسی و نیمچە رووت و بەرنامەی لابەلای کەناڵەکان دانراوە بە مەبەستی دروستبوونی نەوەیەك هیچ پەیوەندییەکی بە خواوە نەبێ ، ئەی ئەمڕۆ ئێمە نابینین لە کۆمەڵگە موسڵمان نشینەکاندا خەڵکانێك بە رۆژی رووناك هێرش دەکەنە سەر ئیسلام و خەڵکی و داپۆشین و حیشمەت و رێز دەدەنە بەر تانە و تەشەرە ؟ ئاخۆ ئەمانە چی مەبەستێك پاڵی پێوە ناون بەوەی رقیان لە داپۆشین بێتەوە ؟ ! جگە لەوەی لەزەت لە رووتی بینین و لاوازی هەستی پەیوەندی نێوان خوا و مرۆڤەکان تێ بگەن .

هەر خۆیان دەڵێن لە نێو نەتەوەکاندا رەوشتێکی نەخۆش و قێزەون بڵاودەکەینەوە کە یارمەتیدەری وێرانکردنی خێزان و، داڕنینی کۆمەڵگە بێ لە تایبەتمەندیە رەوشتیەکان [٣]

---

[٢] خوێنەر دەتوانێ تەماشای کتێبی ( چێشتی مجێور ) ی مامۆستا هەژاری موکریانی بکات .

[٣] الرفاعي : حقيقة اليهود ، لا ٤

لەمڕۆدا باش ئەم حاڵەتە تیدەگەین و بەچاوی ئەم خیانەتە هاوسەرگیریە دەبینین کە بەرۆکی زۆرێك خێزانی گرتووە و منداڵەکانی بێ ناز کردووە، کەسانێکی رۆشنبیر هەن داوا ئەکەن کە خۆشەویستی بکرێت، بەڵام هەر لە دادگاکان و چیرۆکی کتێب و گۆڤار و رۆژنامە ئازادیخوازەکانیش ا تێ دەگەین کە چەندێکی کردوتە قوربانی و کێ ی کردۆتە گورگ و برسی ئاسا کچان و ئافرەتانێکی راو کردووە و خودی رۆشنبیرەکەش ئامادە نیە ئەو ئافرەتە بە هاوسەر بکات و ببێتە دایکی منداڵەکانی .

نوسەرێك کە ئەوپەڕی باوەڕی هەیە بە خۆشەویستی و تێکەڵی و لەزەتی لێ دەبینێ، ژنەکەی خۆی تەڵاق داوە بەو بیانووەی مەعشوقی کەسێکی دیکە بووە و ئامادە نیە بەردەوامی بە ژیانی هاوسەری بدات لەگەڵ کەسێکدا کە دڵی لای کەسێکی دیکەیە، من ئەو نوسەرە وەکو دەیناسم ئاین لای ئەو کاریگەری نیە، بەڵکو هەندێ جاریش لاقرتێی لێ دەکات و لای ئەو مایەی کۆنەپەرستیە ! ئەوەیە رەوشتی نەخۆش، تۆ کە باوەڕت بە خیانەت نیە، بۆ چ دژ بە ئاینێك دەوەستیتەوە کە دژ بە خیانەتکاریە بە گشتی و شەرەف و گەورەیی مرۆڤ دەپارێزێ،لە کاتێکدا لە سەر ئازادی ئافرەت دژ بە ئیسلام دەدوێ ؟ !.

بۆیە دەبینین پلانی بیری جولەکە زۆرێك بەرهەمی لە نێو خۆماندا دروستکردووە و لەسەدا سەد ئەو گوریسەی بۆ خنکاندنمان دروست کراوە خۆمان خستومانەتە گەردنی خۆمان . ئەو خۆگۆڕینە ! داوێن پیسی و بەرتیلخۆری و فلیمی بەدرەوشتی بۆ کردوینەتە دیاری .

دەرونی مرۆڤ بەزۆری لاوازە، بە تایبەت لەوەی ئازدی سێکسی بێتە ئاراوە، ئەوانیش باش دەزانن لە کوێدا خاڵی لاوازی مرۆڤەکان لێکۆڵینەوە بکەن، موحەممەدی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) دەفەرموێت :

(( ما ترکت بعدي فتنة أضر على الرجال من النساء )) [1]

---

[1] رواه البخاري .

واتا : له دوای من شتێك نەماوە بە قەد ئافرەت مەترسی بن لە سەر پیاوان .
فیتنە لەم فەرموودەیەدا ئافرەتان نین وەکو هەندێك وەها دەڵێن و لەسەر ئیسلام وەریدەگرن، فیتنە لێرەدا هەردوو ڕەگەزە کە کەوتنە تاوانەوەیە و هەست نەکردنە بە بەرپرسیارێتی و پەشێوی و هەڵس و کەوت نەکردنە بە داواکارییەکانی شەریعەت و ڕەچاونەکردنی هەستی بەرامبەر و تێرکردنی ئارەزووە وەکو ئەوەی لە ئەورووپادا هەیە .

ئاژاوەکە لێرەدایە کە نەریتی دوژمن بکەیتە نەریتی خۆت . هەریەك لە هەردوو ڕەگەز پێویستی بەوی بەرامبەر هەیە ، لە چوارچێوەی خێزاندا کۆ دەبنەوە، ئیسلام دەیەوێ ئەو دوو ڕەگەزە بۆ یەکتر بژین و خۆشەویستی دەربڕن، داوا دەکات پەیوەندییەکی هاوسەرداری ببەستن و جوانی و ناز ببەخشنە یەکتر، داواش دەکات ڕێز لەو نازەش بگرن و لە دەستی تەماحاوی کەسانی تر بپارێزرێن، کەچی وەکو لە گۆڤارێکدا خوێندومەوە کچێك شانازی بەوەوە دەکات کە جەستەی سرنج ڕاکێشە و تەعلیقی کوڕانیشی بە دەستکەوت دەزانێت ! هەر ئافرەتێکی یەکێك لە ڕێکخراوە ئافرەتیەکان دەڵێت : پیاوی وا هەیە بۆ ژنی بە ئەژنۆ دەکەوێ، کە ژنەکە بە دەمیەوە ەچێ، دوایی دەڵێ فلانە ژنم وا لێکردووە

ئەوەیە ئەو ڕەوشتە نەخۆشەی ئێستاکە لە کۆمەڵگەدا دەبینین و لە موبایلەکاندا ئەتکی ڕێز و حورمەتی خەڵکی دەبینرێت، بۆیە پێویستە هەمیشە وریایی بکرێت لە بەد ڕەوشتی و پێشهاتەکانی و لە سەرووی هەموویەوە خوا لە یاد نەکرێت، نەوەك خوانەخواستە دوای دەیان ساڵی بێ ئاگایی پاشان بڵێین ئێستاکە زانیومانە خۆدانەپۆشین و خۆنەپارێزی و کوڕان خستنە گێژاوی سەرگەردانی تاوانە، ئێمە پێویستە خۆمان لە دیاردە خراپەکان بپارێزین، چونکە بەشێکی گەورەی ئەمنی نیشتمانیمانە و ئەو مەترسیەیە کە وڵاتە گەورەکانی جیهان بۆخۆیان باش دەرکیان پێ کردووە، ئەوەتا ئەمریکا کار دەکات لەسەر جیاکردنەوەی کچان و کوڕان لە قوتابخانەکاندا، کەچی کەسانێکی لای خۆمان بۆ نامۆ نەبوونی کچ و کوڕ

بەیەکتر ! بە پێویستی دەزانن تێکەڵی هەبێ، ئەی ئەگەر تێکەڵی نەبوون نامۆیی بێ، ئەو کوڕ و کچانەی کوڕ وکچی ئەو دایك و باوکە نین کە بە نامۆ دەزانرێن و پێشتر هاوڕێ نەبوونە و ئێستا هاوسەری یەکترن ! ؟

خۆزگە لێکۆڵینەوە دەکرا لە تێکەڵبووندا چی ڕووداوی خراپ و کاریگەری خراپی دروست کردووە و لە داهاتووشدا چی دروست دەکات، ئەوەش کەسانێك پێی هەڵدەستان کە تەنیا ڕاستەقینەیان مەبەست ئەبوو. بە چاو دەبینین و بە گوێ دەبیستین کەچی هەوڵێك لە ئارادایە و ئەنجامەکەی پاشاگەردانییەکە کە گەنج ( کوڕ ) بە چاوی گومانادوییەوە بڕوانێتە کچ و لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرداری بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی بگەڕێ .

قورئان ڕووناکییە بۆ کەسێك ڕووناکی بووێت، خوای گەورە لە قورئاندا دەورووبەرمان پێ دەناسێنێ، لەو دەورووبەرە سەخت گیر و ئاژاوە گێڕەش جولەکەیە :

(( وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاء وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كُلَّمَا أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللّهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ )) [1]

واتا : جولەکەکان وتیان دەستی خوا بەستراوە و هیچی نیە، بەڵکو دەستی خۆیان بەستراوە بەوەی وتیان نەفرەتیان لێ بێ، بەڵکو خوای گەورە دەستەکانی کراوەیە و ئەوەی بیەوێ دەبەخشێ، کەچی لە جیاتی ئەوەی باوەڕ بهێنن بەو قورئانەی بۆت هاتووە کەچی زیاتر خەریکی زیادەڕەوی و بێ باوەڕی کردنن تا ڕۆژی قیامەت و دوژمنایەتی خستۆتە نێوانیانەوە، هەرچ کاتێك ئاژاوە و پەشێویەك بخولقێنن خوای گەورە دایدەمرکێنێتەوە، ئەوان بە زەویدا بە شوێن خراپە کرای و تاوانەوەن وخوای گەورەش حەز بە خراپەکاران ناکات .

[1] سورەتی : المائدە ، ئایەتی ٦٤

ئایەت گەلێکی زۆر هەیە لە قورئاندا باسی جولەکە دەگێڕنتەوە، بە کەمترین روانینێکیش بۆ سیاسەتیان ئەو ئایەتانە بەسن بۆ وریا بوون .

ئامرازەکانی راگەیاندنی ئەمڕۆی جیهان بە دەستی جولەکەوەیە، ئەو دەزگایانە کار دەکات لەسەر بلاوبوونەوەی بەرەڵڵایی و بێ باوەڕی و پەرتەوازەیی موسڵمانان و گومان خستنە بیری موسڵمانانەوە، تاوەکو موسڵمان هەست بکات بە دواکەوتوویی و پاشان بە وەرگرتنی زانست و مەعریفە واز لە ئاینەکەی بهێنێ، جولەکە و گاورەکانیش ئاینیان بە پاڵ پشت کردووە و توانیویانە نەوەی موسڵمان بە هەموو توانا و ئامرازێکەوە بگەیەننە داوێن پیسی و کارە خراپەکان، ئەو مەبەست و ئامانجەیە کە ( زویمر ) ی قەشە لە کۆنگرەی تەبشیریەکان رایگەیاند کە ئامانجی تەبشیریەت لەوەدا نیە موسڵمانان بە مەسیحی بکات، نەخێر، بەڵکو ئامانجی تەبشیریەت دەرکردن و دورخستنەوەی موسڵمانە لە ئیسلام تاوەکو ببێتە مەخلوقێك و هیچ پەیوەندییەکی بە خواوە نەمێنێ، پاشان وەهای لێدێت هیچ پەیوەندییەکی بە ئەخلاقەوە نەبێ

بە هەر جۆرێك بکرێت بەو سەروەتە دۆزراوەی خودی موسڵمانان وێنەی بەد رەوشتی و فیلم و هەستی خۆپەرستی بلاو دەکەنەوە، بەندیخانە بۆ موسڵمانان دروست دەکەن و لە دەرەوە و لە نێو خۆی خاکی موسڵمانان کۆتی موسڵمانان دەکرێت و تانە دەگرنە ئیسلام و بێ خوێندنەوە ئەو تانەیە لە نێو خۆیدا دەوترێتەوە، کەچی لە جیهانی مەسیحیەتدا کەخوێندنەوە بۆ ئەو تانەیە دەکرێت بە قازانج بۆ ئیسلام دەگەڕێتەوە .

گەرچی ئەو پیلانانە لە ئارادان و دەیان کەناڵی بەد رەوشتی پەخشی وڵاتە موسڵمان نشینەکان دەکرێت کە ئامانجی لادانی گەنجانە و سەرقاڵکردنیانە بە نەخۆشیە دەرونی و جەستەییەکانەوە، ئەوە موسڵمانان بە زانا هیمەت بەرز و بیریارەکانیانەوە بەردەوام وەکو شاخ لە دژ بە وەها

شەپۆلێك دەوەستنەوە، قەڵان بۆ پاراستنی ئوممەتی ئیسلامی و مرۆییەتی
نەوەکان و فراوانکردنی چوارچێوەی راگەیاندنی ئیسلامی بە مەبەستی
ئامۆژگاریکردنی گەنجان و رۆڵی مزگەوتەکان، سەرەڕای ئەو
بەرتەسککارییەی مزگەوتەکان بە خۆیەوە دەیبینێ و ئەو رۆڵەی بۆ
نەهێڵراوەتەوە وەکو ئەوەی رابردوو کەڵە پیاوانی دروست دەکرد و ئەو
زانایانەی دروستکرد کە ئێستا سەرچاوەی زانیاری و لێکۆڵینەوە
زانکۆییەکانی جیهانن.

بابەتی ئەخلاقی لای جولەکە هیچ سەنگێکی بۆ نیە، لە ( ٢٤ ی مارسی ١٩٨٣ ) کنێست دەنگی لەسەر یاسایەك دا بەوەی نێربازی کردەیەکی کۆمەڵایەتی و هەڵس و کەوتێکی سروشتیە و نێربازی ئاسایی دەبینن و تەوراتیش نێربازی بە کاری پێغەمبەران دەزانێ و داودی پێغەمبەر بە نێرباز لەقەڵەم داوە [٢].

ئەمە نەك هەر لای جولەکە، بەڵکو لە ئەمریکا و هەندێ وڵاتی دیکەی رۆژئاوادا بابەتی نێربازی دەکرێتە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن و پڕوپاگەندە دەکرێت گەر دەنگ بە دەست بهێنن، ئەوا نێربازی دەکرێتە کردەیەکی دانپێنراو. ئەوان لە ئافرت تێر بوون و بە سەرچاوەی دەردە سێکسیەکانیان دەزانن و لە کردنە کاڵای بە سێکس کردندا تێر بوون ، بۆیە ئەم جار کاتی نێر بازییە وەکو ئەوەی قەومی لوط ( علیە السلام )، یەکێکی تر لە ئامرازەکانیان بۆ بڵاو کردنەوەی سوکی و ریسوایی ، بەکاربردنی وشەی ( ئازادی ) یە بۆ ئامانجێکی نزم، هەروەکو لە پرۆتۆکۆلێکدا هاتووە : بە راستی وشەی ( ئازادی ) کۆمەڵگە دەخاتە ململانێوە لەتەك هەموو هێزێکدا، تەنانەت لەتەك هێزی سروشت و هێزی خواش، بۆیە کاتێك بە دەسەڵات

---

[٢] مصباح محجوب : بيت العنكبوت ، تناقضات و صراعات و سلبيات المجتمع الاسرائيلي ، لا ٢٦

دەگەین پێویستە وشەی ئازادی لە فەرهەنگی مرۆییدا وەها داپلۆسین بەوەی مێمای مێزی دڕندەییە کە گەلان وەکو ئاژەڵ تینو بە خوێن بکات، پێویستە ئەوەش بزانین کە ئەم ئاژەڵانە کە لە خوێندا تێر بوون، ئەو کات خەوێکی قوڵ دەکەن، لەو کاتەدا ئاسانە دەستەمۆیان بکەین و بە کۆیلەیان بکەین، ئەم ئاژەڵانە گەر خوێنیان پێ نەدرێت ئەوە ناخەون، بەڵکو کوشتار دەکەن [1]

ئەوان ئاوەها دەڕواننە کۆمەڵگاکان و بە چاوی ئاژەڵکردن و بێ ئاگاییکردن هەنگاویان بۆ هەڵدەگرن، تەنانەت مەسیحیەکانیش لەو پیلانە بەدەر نین .

هەندێ کڵێسبایان هەیە بۆ هەردوو رەگەز، ئامانج لەوەدا ئەوەیە زۆرترین ژمارەی خەڵکیان لە دەور کۆبێتەوە، بە تایبەت کێبرکێ ی زۆر لە نێوان کڵیساو رێبازە جیاوازەکاندا هەیە بۆ کەمەندکێش کردنی خەڵکی.

سەید قوتب دەڵێت : کڵێساکان بە بڵاو کردنەوەی وێنەی رەنگاو رەنگی سەر دیوارەکان بۆ راکێشانی خەڵکی پڕوپاگەندە دەکەن، بەرنامەی چێژ وەرگرتن دەخەنە روو ، بەو شێوەیەی بار و سینەماکان پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن، لەوەشدا کێشەیەك نیە بۆ وەکاربردنی جوانترین کچانی شار لە جوانی سەماکردن و بەرگی تەسك و سرنج راکێش و روتیدا تاوەکو خەڵکی بۆ کۆ ببێتەوە [2]

ئیسلام لە موسڵمانان داوا دەکات پابەندی بنەما ئەخلاقیەکان بن، موحەممەدی پێغەمبەریش ( صلی الله علیە وسلم ) ئامۆژگاری موسڵمانان دەکات نەوەکانیان لەسەر یەکتاپەرستی پەروەردە بکەن و پێغەمبەران بکەنە سەر مەشق ، کە بۆ خۆیان و کۆمەڵگە بە گەورەیی و بەختەوەری دەگەڕێتەوە

---

[1] الخطر اليهودي ، بروتوكولات حكماء صهيون ، بروتوكول الثالث ، لا ١٣٦ ، ١٣٧

[2] سيد قطب : الاسلام و مشكلات الحضارة ، لا ٨٣ .

مەبەستە شەرعیەکانی ئیسلام پێنج شتە ، کە پاراستنی ئاین و دەروون و ژیری و رەچەڵەك و سەروەتە، ئەمڕۆ ئەوەی ئاراستەی جیهانی موسڵمان نشین دەکرێت لێدانە لە گەورەیی رەچەڵەك، ئەوەی منداڵ رەسەنێتی خۆی بناسێ و گومان نەکات لە ناسنامەی ئەو کەسەی دەبێتە باوکی، چ ژیریەکە داوا دەکات رەگەزی نێر و مێ تێکەڵ بە یەك بن و هاوڕێتی بکەن ؟ ئەی ئەو هەموو دەردە سەریە چی یە کە بۆ ئافرەتان دروست دەکرێت و لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەیخوێنینەوە کە چۆن کەسانێکی نەفس نزم دەیان ئافرەت دەستەمۆ دەکەن و شیرازەی سەدان خێزان تێك دەدەن ؟ ئەگەر ویژدان بکرێتە سەنگی مەحەك ئەو کات زۆر بە روونی حەقیقەت دەناسین .

کاری جولەکە و گاورەکان نەهێشتنی ئاین و لە نێو بردنی مرۆڤەکانە، بە لەدەستدانی ژیری لەوەی مرۆڤ نەزانێ خوا چیە و رەچەڵەك و شەرەف و گەورەیی چیە، کەچی هەندێکی لای خۆمان لەوەی ئافرەتێك دەکوژرێت، لە جیاتی ئەوەی چارەسەری ئەو دیاردەیە بکرێت دژی شەرەف دەوەستنەوە، ئیسلام پیاو و ئافرەتی ئەرکدار کردووە ( مکلف ) لەوەی سنوری شەرعی نەبەزێنێ، لە پاداشتی کاریشدا وەکو یەك رەچاو کراون،ئەوەی وەهای کردووە لە داوێن پیسیدا تەنیا ژن سزا بدرێت، کاری ئیسلام نیە، بەڵکو کاری ئەو کە نەریتەیە پیاوی لەو سزایە جیا کردۆتەوە، گەرچی ئیسلام تۆمەتی داوێن پیسی قورس وەرگرتووە و تۆمەتبارکردنی خەڵکی ئاسان نیە و بۆ تەماحکاریە داوێن پیسیەکان سنوری داناوە

هەروەکو عەلی عیزەت دەڵێ : ژیان لە ئیسلامدا دوو هۆی تەواو بەڕێوەی دەبەن :
یەکەمیان ئارەزووی سروشتی لە بەختەوەری و هێز .
دووەمیش کەمالی ئەخلاقیە ، لە رووی تیۆرییەوە دژ بە یەکن، بەڵام لە ژیان و لە پێش چاوماندا بە شێوازگەلێکی جۆر بە جۆر پێکەوەن، ئەمەش تەنیا بە مرۆڤ بەخشراوە، لە میانەشیدا بڕیاری لەسەر دەدرێت، بەڵام مرۆڤ فرە ڕێژ و زۆر مشتومڕکارە [1]

---

[1] الاسلام بين الشرق و الغرب : علي عزت بيجوفيتش ، ل ٣١٤ ، ٣١٥

## ململانێی فیکری

بابەتی فیکر، لە گرنگترین هۆکارەکانی ململانێ ی ئاینەکان و فیکرەکانی دیکەیە تا ئەمڕۆ، جولەکە و نەسرانیەتیش لە پاڵ جەنگە ئەخلاقی و سەربازی و ئەوانی دیکەدا کاری لەسەر دەکەن و دەیان و سەدان لایەنیان بۆ ئاوەڵا کردووە

داگیرکارە خۆ پەردەپۆشکارەکان بە ناوی ئاینەوە کاتێك لە خاکی موسڵماناندا بە زەبری هێز جێ پێ ی خۆیانیان کردەوە، لایەنی سەربازی ئەو هاوکارەیان نەبوو، بە قەد ئەوەی بێ ئاگایی تاکی موسڵمانیان لە ئاینەکەی بەکاربرد بۆ بابەتە فیکریەکان بۆ کەنار خستنی ئیسلام لە ژیان، گەرچی ئەو هەموو بابەتانەی ئەوان دەیان ورووژاند و ئێستاش لە ورووژاندنیدان، ئەوا ئیسلام بەرنامەیەکی بەهێزی هەیە بۆ وەڵامدانەوەی هەموو سەردەمەکان .

بەربارا براون دەڵێ هەرچ کاتێ ئیسلام لە بڵاو کردنەوەدا بەردەوام بێ، ئەوە رێکخراوەکانی وەکو مەڵبەندی کەهنوتی بۆ موسڵمانانو پەیمانگای ( زویمەر ) لە گەیاندنی کاریاندا زیاتر بە هێز و شارەزایی وەردەگرن [1]

ئەم ململانێیە و دروست بوونی کێشەی تێ گەیشتن لە نێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، دەگەڕێتەوە بۆ شکستی ئەو خوێندکارانەی دەچوونە ئەورووپا و لەبەردەم شەهوەتبازی ئەورووپا شکستیان دەهێنا و بە دۆڕاویەوە دەگەڕانەوە نێو وڵات و هەر ئەوانیش دواتر دەبوونە کار بە دەست و لە راپەڕاندنی کارەکاندا لەوەی هیچ شتێك سەوز نەکات دەکۆڵنەوە و رواڵەتانە دەکەوتنە وێزەی شتەکان و رابردووی زێڕینی میللەتی خۆیانیان لە بیر دەکرد، ئەمەش پلانێکی جولەکەیە بۆ ئەوەی ئەو نەوەیەی لە بەردەستدایە بە جۆرێ رابهێنرێت کە رابردووی خۆی نەناسێ و خاك و خەڵکی نیشتیمانی خۆی بە کەم بزانێ

---

[1] بربارىراون : نظرة عن قرب في المسيحية ، لا ٩٠ .

هێرشی سەربازیانەی داگیرکاری و بیری کاریگەری لە نێو موسڵماندا هەبوو بۆ بیرکردنەوە لە و دواکەوتووییەی ئەم ئوممەتە پێیەوە گیرۆدەیە، هێرشەکان و ئاژاوەی دەسەلاتیش ڕێگر بوون لەوەی سوود لە گەوهەری گرانبەهای ژیاری ئیسلامی وەربگیردرێت کە بۆ ژیانە دواکەوتووەکەی رابردووی ئەوروپییەکانیش سوود گەیەنەر بوو، جەنگ و کوشتار لە خاکی موسڵماناندا و بوونی دەسەلاتی داپڵۆسینی تاکی موسڵمانی ناچار بە گەڕان بە دوای نان و بژێویدا کرد، ناچار بوو لە هەوڵی دەستەبەری ژیانی منداڵەکانیدا بێت و لە زۆر کاروباری گرنگی ژیاندا کە مایەی هەستانەوەی ڕۆڵی شارستانیەتی ئەم ئوممەتەبێ بە دوور بێت، یان بێ ئاگا و نە شارەزابێ لە مێژووەکەی، هەروەکو ئەمرۆ کە مێژووی گەورەی میللەتانی موسڵمان و تەنانەت خودی ئەو هاوەلانەش کە ئەم ئوممەتە شانازیان پێوە دەکەن شێوێندراوە و تاکی موسڵمان لە راستیەکەی نە شارەزایە

ئەوروپیە بەرژەوەند خواز و بیریارە دژەکانیان ئەوەیان دەرازاندەوە کە هۆکاری دواکەوتنی موسڵمانان تەنیا ئیسلامە، چونکە ڕێزی ئازادی ئافرەت ناگرێت و بۆ کارکردن و موممارەسەی کاری پیاوان ڕێگەی نادات، لەو پێناوەشدا ڕێکخراوە ژنانی و بیریەکانیان دروست کردووە لەسەر حیسابی تانەدان لە ئیسلام و نەفرەت کردنی بیری ئیسلامی، لە کاتێکدا کۆمەڵگە بە گشتی لە چەوساندنەوەیەکی سەرتاپادایە، ئەوەی ئەم بالۆرەیەی دەوتەوە لە ڕاوکردنی ئافرەتە جوانەکان و پشتگوێخستنی ئەوانی دی دا بوو .

جولەکە دوو ڕووەکان، ڕێچکە لادەر و تێکشکێنەرەکانیان بۆ خەڵکی جوان دەکرد و ئافرەت و قومار بازی و عەرەق خواردنەوەو تێکەڵیان دەخستە نێو حزب و ڕێکخراوەکانەوە، هەر ئەوانیش بەو ئامرازە ریسواییکارانەوە بە ملیۆنان مرۆڤیان خستە گێژاوەوە، دەنا ئەو ڕێکخراو و حیزبانەی نێو خاکی

موسڵمان نشین، بە درێژایی ئەو دەیان ساڵەی ئیسلام لەم خاکەدا دەسەڵاتی نیە، چ پێشکەوتنێکی دەست پاکانەیان وەدی هێناوە کە ئیسلام رقی لێ بووبێتەوە ؟ ! جگە لە قومارخانە و بارەکان، گەرچی ئەو وشەیەی بار لای ئەوان بێ رێزیە و بە مەلها پێشکەوتوویی دەگەیەنێ !

بن غۆریۆن دەڵێ : ئێمە لە ناوچەکەدا لە سۆشیالیستی و شۆڕشگێڕ و دیموکراتخوازەکان ناترسین، تەنیا لە ئیسلام دەترسین، ئەو دێوەی لە زووەوە خەوتووە و خەریکە بە ئاگا دێت [1]

شارۆنیش دەڵێ : هیچ هێزێك نیە بە قەد هێزی ئیسلام لە راکێشانی جەماوەردا کاریگەربێ، ئیسلام تاکە بناغەی بزووتنەوەی نیشتمانی ئیسلامیە [2]

لەبەر ئەم مەترسیانەش وەکو رابردوویان پێویستە، پەنا ببەنە بەر هەموو ئامرازەکانو بەکارهێنانیان لە بڵاوکردنەوەی ئەو بیرە زەبەلاحانەی کە بە خۆیانیش هەڵناگیردرێت و کۆمەڵگە دەخاتە گێژاوەوە و پاشان لەوەدا ئیسلام بەرپرسیار دەزانن !

لە زووەوە بۆ خەڵکیان روون دەکردەوە کە عەلمانیەت تاکە رزگاربوونە لە دواکەوتن و پاشکۆیەتی، کەچی عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامدا زیاتر پاشکۆیەتی نواند و لە هەوڵیشدا مێژووی نەتەوەی موسڵمانیش سەرنگوم دەکات و سەختگیرانە بەرگری لە دژ بە ئاین دەکات، کەچی لە خودی ئەوروپادا رێکخراو و حیزبە ئاینەکان لە دەسەڵات و پەرلەماندان و خودی دەبلیو بۆشیش شانازی بەوەوە دەکات ئەگەر مەسیح نەبوایە ئەو بە کۆشکی سپی نەدەگەیشت، ئەو لە لوتکەی دەسەڵاتدا شانازی بە بیر و باوەڕی مەسیحیەتی خۆیەوە دەکات و ئەحمەد بۆرقیبەی

---

(1) معالم قرآنية ، لا ١٧٣

(2) مردة سليمان ، قصة الرؤوس التي اوجدت امبراطورية إ سرائيل ، د . فؤاد البنا ، لا ٣١٤ ، ١٤٢٤ ك - ٢٠٠٥ م .

سەرۆکی پێشووی تونسیش لە مانگی رەمەزاندا و لەبەردەم جەماوەری وڵاتەکەیدا پەرداخە شەربەت دەخواتەوە ، ئەمەیە کلکایەتی کردن و پاشکۆیەتی کردنی ئەوروپا، لەوێدا تەپڵێ لێ بدرێت لای ئێمە هەزاران جار سەدای بۆ دەدەینەوە، گەرچی پەیڵ لێدەرکەش بێزی بەو شێوازە هاتبێتەوە کە تەپڵی پێ لێ دابێ !

ئیسلام زۆر راشکاوانە بەرنامەی خۆی رادەگەیەنێ، شەرم لە هیچ کەس ناکات، بناغەی بیر و بانگەوازی ئیسلامی لە فرمانی موحەممەدی پێغەمبەردا ( صلى الله عليه وسلم ) دەردەکەوێت کە موعازی کوڕی جەبەلی پێ ئامادە دەکات بۆ چوونە یەمەن و پێ ی دەفەرمووێت (( إنك تأتي قوماً من اهل الكتاب ، فليكن اول ما تدعوهم اليه شهادة أن لا اله الا الله ) [٢]

واتا : ئەی موعاز تۆ دەچێتە لای نەتەوەیەکی ئەهلی کیتاب، با یەکەمین شتێك کە بانگەوازیانی بۆ لا دەکەیت، شایەتی دان و داننان بێ بەوەی جگە لە "( الله ) هیچ خوایەکی دیکە نیە

پەیامی ئاسمانی دەبێ ئاوەها راشکاوانە ئەدا بکات، ئەمە ئەو راستیەیە کە جگە لە خوا بۆ هیچ کەسێکی تر ملکەچی نانوێندرێت، فرمانی هیچ کەس لە سەروی فرمانی خواوە نیە، مرۆڤەکان لە یەك ئاستدان و یەکسانن و لە پشتی ئەوەوە فرۆفێڵ و هەڵخەڵەتانیان نابێ هەبێ

بیری بانگەشەکارانی ئاینی جولەکە و نەسرانیەت لەگەڵ ژیریدا گونجاو نیە، بەتایبەت لەو بابەتانەی لە بارەی خوێنی مەسیحەوە هەیە، پێچەوانە بە ئیسلام کە حیکمەت دەخاتە سەر شتەکان،

---

[٢] متفق عليه

هەروەکو عەلی عیزەت بیجوفیتش دەڵێ :

حەرامکردنی ئارەق و سەرخۆشی لە ئیسلامدا بە پلەی یەکەم سیفەتێکی کۆمەڵایەتیە، چونکە سەرخۆشی خراپەیەکی کۆمەڵایەتیە و بە تەنیا لە ئایندا شتێك نیە دژ بەوە، بەڵکو هەندێ لە ئاینەکان مادده کحولیەکانیان وەکو هۆیەکی پیشەسازیانە بەکارهێناوە، وەکو ئەو تاریکایکردن و بۆنی بجوردە سوتاوەکانی کاتدریەکان .......مەسیحیەکان هیچ هەڵەیەك نابیننەوە لەوەی عەرەق لە رێگەی قوربانی پیرۆزەوە ببێتە خوێنی مەسیح ،بۆیە لە مەسیحیەتدا حەرامکردنی عەرەق وسەرخۆشی نابینین وەکو ئەوەی ئیسلام حەرامی کردووە، ئیسلام رێرەوی زانستی گرتووە نەك تەنیا رێرەوی ئاینی رووت [1]

لە پاڵ ئەوەشدا ئەوە دەڵێن کە ئیسلام مایەی داخراوی و دواکەوتوویيە، بەلآم لە رووداوی یانزەی ئەیلولدا و لە هێرشکردنە سەر ئیسلام و ناساندنی بە شێوەی ناشیرین ئیسلام قازانجکار دەرچوو، لە میانەی لێکۆڵینەوەی ئەم ئاینەدا خەڵکانی رۆژئاوا رووی راستەقینەیی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتوو بە پشت هەڵکردن لە ئاینی وڵاتی خۆیان روویان کردە ئیسلام و بنەما زانستیەکەی ئیسلامیان قبوڵکرد

لە ئەوروپای دیموکرات خواز و مافی مرۆڤدا ! هێرشی فیکری و ئەخلاقی زۆر دەکرێتە سەر موسڵمانان، ئەوەتا بوونی هێزی ریشکە قایمی ئیسلام لە بلاو بوونەوەدا لە وڵاتێکی وەکو سویسرادا لە ٢٠٠٩ ز دا منارەی مزگەوتەکان قەدەغە دەکرێن و لە فەرەنسای لانکەی عەلمانیەتدا سەرپۆش قەدەغە دەکرێت، دەست بردن بۆ ئەو بابەتانەی ئاسایشی وڵات نالەبار دەکەن ئەوپەڕی سزای لەسەرە، کەچی بانگەشەکارانی ئازادی ئاسایشی وڵات لە ئاین و مرۆڤەکان هەراج دەکەن و چۆنیان بووێ بەو جۆرەی دەرێسن .

---

[1] علي عزت بيجوفيتش : الاسلام بين الشرق والغرب ، لا ٢٨٧

له دانیمارکیش سەودای ئازادی دەگاتە ئەوەی وێنەی کاریکاتێری لەسەر موحەممەدی پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) بکێشن و ناشیرینانە ئاماژەی بۆ بکەن، ئەوەش بەرهەمی ئەو ئاینە شوێنراوەیە کە بەهای ئەخلاقی تیایدا بەخشراوی دەستی مرۆڤە تەماحبازەکانە، لە پای ئەوەی بێ دوورخستنەوەی رق و تووڕەیی موسڵمانان هەندێ لایەنی مەسیحی ئیدانەی دەکەن، ئەوەش سیاسەتێکە لە پاڵ دەیان فرۆفێڵی وەهادا کارامەن، کەچی خەڵکانێك لە خاکی موسڵمان نشیندا لە ڕێگەی کەناڵە تەلەفزیۆنی و رادیۆکانەوە دەست لە سینگانە بابەتە دژە ئەخلاقی و ئیسلامیەکان پەخش دەکەن و راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ تانەی داخراوی دەگرنە ئیسلام، بەمەبەستی باشترکردنی رەوتی زانست لە وڵاتدا لە هەوڵی تەواوی گۆڕانکاری خوێندندان کە تا سەر مەبەستی ئەوان شتە شەهوانیەکانە و هەڵکوتانەسەر ئاین و بەر تەسککردنەوەی ئادابەکانێتی، ئاخۆ کێ لەو داوایەی ئاین زیان دەکات کە داوای مرۆڤبوون و رەوشتی جوان دەکات لە مرۆڤ ؟ لە کام ئایەت و فەرموودەیەکدا زانست و زانیاری لە کوڕ و کچ یان پیاو و ئافرەت ، یان پیر و گەنج حەرامکراوە ؟ ئاخۆ ئیسلام رێز لە ئافرەت دەگرێت یان جولەکە و نەسرانیەت ؟

ترتولیان ( Tertulion ) یەکێك لە گەورە مەسیحیەکانی سەرەتا لەبارەی ئافرەتەوە دەڵێ : ئافرەت دەروازەی شەیتانە بۆ گەیشتنە دەروونی مرۆڤ ، ئەو پاڵنەری مرۆڤ بوو بۆ خواردنی قەدەغە کراو، ئافرەت ناتەواوکاری یاسای خوا وشێوێنەری وێنەی خوایە ........ واتا وێنەی پیاو [٢]

---

[١] سید قطب : الاسلام و مشکلات الحضارة ، لا ٧٣

لە سۆنگەی ئازادی ئەواندا ئافرەت بۆتە پڕ فرۆشی کاڵاکانیان، لە پڕوپاگەندەی تایت و فانیلە وگۆڤارەکان بە وێنەی رووت و بابەتی سێکسی پڕ فرۆش دەکەن، چ کتێبێك لە وڵاتی ئێمە و وڵاتانی دیکە پڕ فرۆشە، فیکری یان ئەو کتێبە سێکسیەی لە غەزوی فیکریدا بە ئازادی سێکس و تاکە کەسی ناودەبرێ ؟ ! گۆڤاری وەها دەرەچێت دەیان بابەتی تێدایە، کەچی بە وێنەیەکی رووت و وروژێنەر بە ئاشکرا پارەی گیرفانی تازە لاوەکانمان ئەدزرێن .

بیر یارە تازەپێگەیشتووەکانی لای خۆمان کەوتوونەتە گێژاوێکی تێکشکێنەرەوە و ناوی فەیلەسوفە ئەوروپیەکان سەرسامی کردوون، هەموو ئەوەی ئەوان بیڵێن جوان وشیرینە، گەر بوترێت ئەو مافە لە ئیسلامیشدا هەیە رومەتیان چرچ و لۆچ دەبێ. من بۆ خۆم سەردانی یەکێك لە دەزگاکانی راگەیاندنی حیزبێك کردوو بابەتێکم بۆیان بردوو لەتەك سەرنوسەری رۆژنامەکەیاندا دانیشتم و گفتوگۆمان کرد، بە ناوهێنانی زانایەکی گەورەی وەکو غەزالی قەڵس بوو، وتی پێویستە لە زانا و بیریارە عەرەبەکان دەست هەڵبگرین، وتم بەرێز وەکو ئاین خزمەتی یەکترمان کردووە و وەکو ئومەتیش یەك شەریعەت و یەك مەبەست و مێژووی هاوبەشمان هەیە، ئەوەی وتوویانە ژیانی هاوبەشی لێ دێتە دی، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانرێت ئەوەی لە راگەیەندنەکانی ئێوەدا دەبینرێت دژ بە کلتوری ئەم نەتەوەیە و بەرهەمی ئەو فەیلەسوفانەش ئێوە بە گەورەیان دەزانن تەنیا کارگەی قۆرغکارین .

بەڵام با بگەڕێینەوە بۆ رابردوو، هەروەکو مامۆستا محمد مصطفى الشلبي دەڵێ : لە سەرەتاکانی سەدەی یانزەدا ( هربرتی فرەنسی ) لەتەك کۆمەڵێ زانست خوازدا بۆ وەرگرتنی زانیاری روویانکردە قوتابخانە ئیسلامییەکانی ئەندەلوس ، لەوانەش خوێندنی فیقهی ئیسلامی بوو، وانەکانیان بۆ زمانی

خۆیان وەردەگێڕا، لەبەر ئەوەی مافەکان لای ئەوان بە فیڕۆ چوو یاساکانیش ستەمکارانە بوو، بیریان کردەوە لە گواستنەوەی ئەو ئەحکامانەی لە فیقهی ئیسلامیدا بۆیان گونجاوە، بۆ ئەوەش پاشای خۆیانیان رەزامەند کرد و رێککەوتن لەسەر ئەوەی، ئەو بڕیارەی لە فیقهی ئیسلامیدا وەردەگیردرێت بە ناوی شەریعەتی رۆمانی یان یاسای مەدەنی ناوببرێت [1]

ئەوان هەمیشە لە هەوڵدا بوونە بۆ وەرگرتنی زانیاریەکانی ئیسلام و لە رووپەکی دیکەشەوە لە هەوڵدا بوونە و دەبن بۆ کە رخستنی موسڵمان لە ئاین و ئەخلاقیان . بە جۆرەها شێواز جولەکە و گاور کان بیری دژ بە ئیسلام بره و پێ دەدەن و گومان دەخەنە مێژووی ئیسلامەوە و خەڵکانێك رادەسپێرن بۆ دەستبردنە گۆڕینی بڕیارە یەکلاکەرەوەکانی ئیسلام ( الاحكام القطعية ) لەوانەی پەیوەستن بە دەسەڵات و ئەمانەت و جیهاد و حیجاب و وەلاء و بەراء .

لەم بوارەشدا بەهۆی نەشارەزایی مرۆڤی موسڵمان لە ئاینەکەی و ژیارە دەوڵەمەندەکەی، ئەوا جولەکە و گاورەکان هەنگاویان بڕیوە بۆ دروست کردنی بیری تەمومژاوی و وڵاتە موسڵمان نشینەکانیش بووەتە جێ ی پەت پەتێنی ئەو بیرانە کە جگە لە کێشەی تر چارەسەریان پێ نیە، لە کاتێکدا ئیسلام چارەسەری هەموو کێشەکانە و مێژووی بیری مارکس و دەیان جولەکەو گاوری دیکە تەنیا مەرگەساتیان بەجێ هێشتووە

---

[1] الشلبي : المدخل في التعريف بالفقه الاسلامي و قواعد الملكية و العقود فيه ، لا ٢٠٤

## باسی دووەم

### شێواندنی نێوخۆییانەی فیکری موسڵمانان :

ئاین ، ئەو ڕێگریەیە کە پلانی جولەکەی بۆ زاڵبوونە سەر جیهانی تێکشکاندووە ، لەبەر ئەوەی مەسیحیەت لە سەرەتادا بانگەوازێکی ئاینداراانەی ڕاستەقینەیی وئەخلاقی بوو، جولەکە بەوپەڕی دژایەتی بەرامبەری دەوەستایەوە و لە بۆسەدا بوو بۆی، پاشان کە زەمەن بەسەر مەسیحیەکاندا تێپەڕی و لە یەکتا پەرستی لایاندا و کاروباری ئاین لە ڕۆژئاوا کز بوو، مەسیحیەت تەنیا وەکو دروشم مایەوە، پاشان هەر ئەم مەسیحیەتە کەوتە خزمەتی پلانەکانیان و پاشان هەردوولا لە یەك سەنگەردا گرد بوونەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئیسلام و موسڵمانان، ئەوەش بە بلأوکردنەوەی ڕێچکە و ڕێبازی دژە ئاین لە نێو موسڵماناندا بۆ دوورخستنەوەیان لە ئاین و داگیرکردنی بیریان بە بێباوەڕیکردن و ڕۆچوونیان لە ئارەزووە سێکسیەکان، ئەوەش بۆ نەهێشتنی کارایی ئیسلام و زیاتر ڕەخساندنی بوار بۆ دەسەڵاتگرتنە سەر جیهانی موسڵمان نشین

نابێ ڕۆڵی قوتابخانە و زانکۆکان لە بیر بکەین، بە ڕوانین بۆ ئەو تەمەنە زۆرەی لەو بوارەدا بەزایە دەدرێت و ئەو بەرهەمەی کە هەیە، دەتوانین بە ئاشکرا دەرك بەو پلانە ترسناکانە بکەین کە بە شاراوەیی لە هەوڵی لە کەنارخستنماندایە، ئەوان چەندین زانکۆیان لە وڵاتە موسڵمان نشینەکاندا دروست کردووە بە مەبەستی غەزوی فیکری و ڕاوکردنی موسڵمان و فرۆشتنی ویژدان و ئامانجی نیشتیمان و ئاینی لە بەرامبەر پلە و پایە سیاسی و ئیداریەکان

زانکۆ ئەورووپی و ئەمریکیەکانیش کە لە وڵاتی موسڵمان نشینەکاندا هەیە، پلانێکە بۆ پەرتەوازە کردنی یەکبوونی موسڵمانان، هەروەکو عبدالقادر الحسینی لە دابەشکردنی بڕوانامەی دەرچووانی زانکۆی ئەمریکی

**لە لوبنان ساڵی ١٩٣٢ ز دەڵێ : بە راستی ئەم زانکۆیەی کە لەبەر چاوی خەڵکیدا لە رواڵەتی قوتابخانەیەکی جیهانی دەردەکەون ، لە راستیدا کار دەکەن بۆ گەندەڵکردنی بیر وباوەڕە ئاینیەکان، ئەوەش تانەدانە لە ئاینی ئیسلام، زانکۆ ئەمریکیەکان کە پڕوپاگەندە دەکەن بەوەی تەواو زانستیە و هیچ پەیوەندییەکی بە تەبشیریەتەوە نیە، راست نیە [1]**

**رۆجر بیکون کە لە ئینگلترا و ئەوروپا بە چاکسازی ئاینی هەستا، ئەوەش لە رێگەی فەلسەفەکەیەوە، دەبێ بزانین کە فەلسەفەکەی لە زانا موسڵمانەکان و روناکبیرە ئیسلامی و ئەو ژیارە ئیسلامیەوە وەرگرتووە کە موسڵمانان پێکەوەیاننابوو، هەروەکو دو هەرنج دەڵێ : بە راستی بیر و بۆچوونی رۆجر لە بیر و بۆچوونەکانی فەیلەسوف بەناوبانگ فرنسیس بیکون رونتر و تۆکمەترە**

**بەڵام ئاخۆ رۆجر بیکون ئەو زانستەی لە کوێوە وەرگرتووە، ئەوەش لە زانکۆ و قوتابخانە ئیسلامیەکانی ئەندەلوسەوە بوو [2]**

**لە ئینجیلدا و لە ژێر ناوی ملکەچکردن بۆ سوڵتان هاتووە، کە پێویستە هەموو مرۆڤێك ژێر باری فرمانی دەسەلاتی فەرمانڕەوایی بکات، چونکە هیچ دەسەلاتێك بە بێ خوا نیە، دەسەلاتەکان لە لایەن خواوە رێکخراوە،هەرچ کەسێ بەرگری دەسەلات بکات و دژی بوەستێتەوە، ئەوا دژی رێکخستنەکانی خوا بووەتەوە [3]**

**ئەمەیە عەقڵیەتی ژێرباركردن و ملکەچیکردن بۆ دەسەلاتە داسەپاو و دژە مرۆییەکانە و هاوردەکایەی ئەوەی بۆ قەیسەرە با بۆ قەیسەر بێت و ئەوەشی بۆ خوایە بۆ خوا بێ !**

---

**[1] گۆڤاری : التوحید ، الاستشراق ، تاریخه و تقویمه ، ژ ٨٨ ، ساڵی پانزەیەم ، محرم ١٤١٨ ك ، ئایار ١٩٩٧ ز .**

**[2] الاسلام و مشکلات الحضارة ، لا ٤٣**

**[3] الانجیل ، کتاب الحیاه ، لا ٧٨ ، خوێنەریش دەتوانێت زیاتر بۆی بڕوانێ و لەم کتێبەدا وەها دەردەخات کە خوا مرۆڤی دروست کردووە تاوەکو کۆیلەی دەسەلاتێکی داپڵۆسێنەر بێ**

جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت [1] ، یەکێکە لە باسە هەرە دووبارە کراوەکان و بنێشتە خۆشەی زۆر کەسان، بێ روانین و خستنە رووی تایبەتمەندییەکانی ئاینێك کە جیهانی زانست بەرگری لێ دەکات و بە یەك شێوە تەماشای هەموو دیمەن و رواڵەتێك دەکەن و دەیانەوێت وەك پیرمەندەکانی سەردەمی دەسەڵاتی کلێسا لە ئەورپادا ناو دەربکەن و ببنە داینەمۆی بیری ئازادی ! ، لەو پێناوشدا گەورەترین قەیرانی فیکری دروست دەکەن و لەگەڵ ئاینی ئیسلامیش مامەڵەی کلێسایی دەکەن، بێ ئاگا لەو کەسەی کە نازانێت ئیسلام چەندە بەرنامەی پەرستش و خوو رەوشتی جوانە ، ئەوەندە و زیاتریش بەرنامەی بەڕێوەبردنی ژیان و دەوڵەتە

یەکێك لەو کتێبە ئەکادیمیانەی کە ماهیەتی ئاین و دەوڵەت لە ئیسلام شی دەکاتەوە کتێبی ( جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت ) ە و خاوەنەکەشی نامەی ماستەری لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە و بە شێوەیەکی زانستی و بەڵگەی باوەڕپێکراوەو دایڕشتووە، کتێبەکەی لە پێشەکی و دەسپێك و سێ بەند و چەند بەشێك پێکهاتووە، نوسەر لە پێشەکییەکەیدا بە شێوەیەکی خێرا هەوڵەکانی جیاکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە بەڕێوەبردنی ژیانی خستووەتە روو کە لە دوای پێنج سەدەی دوای دەرکەوتنی ئیسلام هێزە خاچپەرستەکان ( الصليبين ) جەنگیان هەڵگیرساند و دوای چەندین شەڕی خوێناوی و تاڵانکردنی سەروەتی موسڵمانان و داگیرکردنی زەوی هات ( دوای چەندین رووداوی یەك لە دوای یەك ئەو بەڵگە زیندووەی بۆ خستنە روو کە پێکهاتە و سیستەمی رۆژئاوایی کە سەرچاوەی

---

[1] بۆ ئەم باسە دەتوانیت تەماشای رۆژنامەی (( بزوتنەوەی ئیسلامی )) ، ژ ( ٣١٢ ) ، ٢٠ / ٨ / ٢٠٠٨ ز بکەی بە ناونیشانی : ماهیەتی دەوڵەت لە ئیسلام و ناسینی ( علی عەبدولڕەزاق ) خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی ( فصل الدين عن الدولە ) ی ئیسماعیل گەیلانی . . لێرەشدا بە گرنگم زانی هەمان خوێندنەوە دابەزێنم بە تێهەڵکێشکردنی چەند سەرچاوەیەکی دیکە کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێ دەدەم . گەرمیانی

لە ئەفریقیا و ڕۆژهەڵات و ئەوروپادا بتوانێت دەسەڵات بگرێتە سەر جیهانی ئیسلامی و [illegible] بچەژێت و دەست بەسەر [illegible] سەرچاوە [illegible] بگرێت

لە دوای چەندین کۆشش [illegible] گەل ( پگرس ناسك ) ی فەرماندەی خاچپەرستەکان بۆ سەر خاکی موسڵمانان، نەیانتوانی مەبەستەکانیان جێ بەجێ بکەن و قەوارەی ئیسلامی لە بیری موسڵمان بەرنەوە ،

پاش ئەمە ( رەمون رول ) لە سەدەی چواردەی زایندا هەستا بە داواکردنی گۆڕینی ( تەکتیك ) ی پێویست لە هێرشە خاچپەرستیەکان بۆ کۆمەڵە موژدەدەرەکان ( التبشیریه )، جێ بەجێ کردنی ئەم پلانە لە سەدەی نۆزدەی زایندا بەرهەمی بانگەشەی عەلمانیەتی نەتەوەیی خستەوە و دەسەڵاتی گرتە سەر بەشێکی فراوانی جیهانی ئیسلامی ( هاملتۆن جب ) دەڵێت: ( ئەو شێوازەی خاوەن خوو نەریتە رۆژئاواییەکان دەسەڵاتی بەردەوامی لە دەوڵەتدا دەستەبەر بکەن هەر نەتەوەیی بوو، بێگومان بیری نەتەوەیی بیرێکی رۆژئاواییە ... ) نوسەر زۆر بە جوانی وردبینی دەخاتە سەر پیلانگێرە ناوخۆییەکان، هەروەك دەڵێت : لە کاتی بانگەشەی عەلمانیەت و هەوڵدانی گۆشەگیرکردنی ئیسلام لە گۆشەی مزگەوتەکان کتێبی ( خلافة و سلطة الامة ) [٢] ،ە ی خاوەن نادیار بڵاوکرایەوە و لە ساڵی ١٩٢٣ ز لە قاهیرە وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی، دکتۆر محمد محمد حسین لەبارەی ئەم کتێبە دەڵێت ( ئەوەی ئاشکرا بێت لیژنەیەکی تورکی سەرپەرشتی دانانی بوو ، دەستی کێشایەوە بۆ ( کەمال ) یەکان و حکومەتەکەیان کەوا سەرپەرشتی کردووە و بە چاپی گەیاندووە و پاڵپشتی بیرۆکە گەندەڵەکەی مستەفا کەمالی کردووە بۆ دورخستنەوەی ئاین لە خیلافەت، ئەویش لە رێگای دۆزینەوەی بەڵگەیەك شەریعەتی پێ بدات !

---

[٢] رایەکیش هەیە کە دەوترێت ( عبدالغني سني بك ) ئەو کتێبەی نوسیوە ، بڕوانە کتێبی ( الأسرار الخفية وراء الغاء الخلافة العثمانية ) نوسەر .

وه پاشان بیرۆکه داگیرکارییه‌کانی دیکه له شێوه‌ی ئایندارێدا به دەرکەوتن که کتێبی ( الاسلام و اصول الحکم ) ی عەلی عەبدولڕەزاق له ساڵی ١٩٢٥ ز بڵاو بوویەوە یەکێك بوو له پیلانەکان، نوسەر ئەو پیلانە کۆمەککاریە زیاتر دووپات دەکاتەوە که له کۆتایی پێشەکیەکەیدا دەیڵێت رۆڵی هەردوو رەوتی رۆشنبیرە راگیرکار رۆژئاواییەکان و دڵسۆزانی جیهانی ئیسلامی دووپات دەکاتەوە . وەك ئەوەی ( تویبنبی ) ترسی خۆی له هەستانەوەی رابوونی ئیسلامی دەردەخات و ئاماژە بە رەگەزە زیندووەکانی ئیسلام دەداتو ئاگاداری دەدات بەوەی جەنگێکی رەگەز پەرستی ( عنصری ) . لەدژی موسڵمانان روو نەدات، چونکە ئەگەری جوڵانەوەی ئیسلام هەیە جارێکی تر رۆڵی مێژوویی خۆی ببینێت .

بەندی یەکەم : روداوەکانی نێوان ئەوروپا و جیهانی ئیسلامی ئەم بەندە ( تەوەرە ) دوو بەشی هەرە گرنگ له خۆی دەگرێت که

ئەمانەن :

بەشی یەکەم : چەمکی ئاین و دەوڵەت له ئیسلامدا :

لقی یەکەم : شمولیەتی ئیسلامی ( بیردۆزەیی )، ئەمرۆ لای زۆرێك خەڵکی ئاین بریتی یە له هەرە شتێك لەگەڵ ژیریدا یەکانگیر بێت و پێچەوانەی دانایی بێت، یاخود کارێکی تاکە کەسیە بۆ رێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان تاك و دروستکاردا، بەم شێوەیە نوسەر باس بە چەمکی ئاین دەکات که ئەمرۆ کەسانێك بۆ مەبەستی دورخستنەوەی ئاین له رێکخستنی ژیان. بەڵام شەریعەتی ئیسلام گشتگیرە و رێکخەرە بۆ هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیان ( تاك و کۆمەڵ )،

وه هەموو ئەو کارانەی پەیوەستە بە بیر و باوەڕ و پەرستش و رەوشت و ( معاملات )،وە ( معاملات ) یش له ئیسلامدا ئەم زاراوە تازانە له خۆ دەگرێت که ئەمانەن :

١. قانون احوال الشخصي : ياساكانی تایبەت بە خێزان و ڕێکخستنی و نیکاح و جیابوونەوە ( طلاق ) و میرات و نەفەقە و وەسیەت لە خۆ دەگرێت .

٢. قانون المدنی : پەیوەستە بە مامەڵەی دارایی نێوان تاکەکان، وەك فرۆشتن و ئیجار و ڕەهن و کەفالەت .

٣. قانون المرافعات : پەیوەستە بە دادوەری و دەعوا و سەرچاوەکانی حوکم و شایەتی و سوێند و بەڵگە .

٤. قانون الدولی الخاص : کە یاسا و بەندە تایبەتەکانی مامەڵە کردنی دەرەکی لەگەڵ غەیرە موسوڵمانان لە خۆ دەگرێت، لە کاتی هاتنە ناوەوەی خاکی دەوڵەتی ئیسلامی و ئەو مافەیان کە بۆ هەیە و ئەو ئەرکەیان لە ئەستۆدایە .

٥. قانون الدولی العام : یاساکانی تایبەتە بە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا لە کاتی جەنگ و ئاشتی

٦ قانون الدستوری : یاسا تایبەتیەکانی پەیوەست بە سیستەمی حوکم و پایەکانی لە خۆ دەگرێت، لەگەڵ چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەت و شێوازی حکومەت و پەیوەندی تاکەکان لەگەڵ حکومەتدا و مافەکانیان لە بەرامبەردا

٧. قانون المرافعات الجنائی : ئەحکامە تایبەتیەکانی تازەکردنەوەی پەیوەندی تاك بە دەوڵەتەوە لە خۆ دەگرێت لە رووی کرداری ڕێ لێگیراوەکان ( تاوانکاری و سزای هەموو تاوانێك )و ئیجرائات کە لە لێکۆڵینەوەی تاوان و بڕیاری سزادانی تاوانباران و چۆنێتی جێبەجێکردنی .

٨. قانون المالی : بە هەموو لایەنەکانیەوە، یان ناوبردنی بە سیستەمی دارایی، هەمووی پەیوەستە بە بەڕووبومی دارایی دەوڵەتی و بانکەکان و ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان و دەوڵەت لەم بوارەدا، لەگەڵ پەیوەندییەکانی پەیوەست بە نێوان دەوڵەمەند و هەژارەکان .

ئەم بوارانە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا پێویستی جێبەجێکردنە، بۆیە ئەمانە لە پێکهاتەی دەوڵەتدا دێتە دی و پایەکانی دەوڵەت دروست دەکەن، چونکە ئیسلام کاروباری ژیانی دونیا لەسەر بناغەی ئاین دادەڕێژێت، ئاینی کردووەتە سەنەدی دونیا و دەزگای ڕێکخستنی دەسەڵات و ئاراستەکردنی دەسەڵاتدار و مەحکومەکان و لەگەڵ ژیری مرۆڤدا دەدوێت، بۆیە لایەنێکی دیاریکرا و گرنگی پێ نادات و ئەوی تر لە بیر بەرێتەوە .

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم ئاینە ( ئیسلام ) جیهانگیریە و سنورێك نی یە بیوەستێنێت، ئاینێکە ئامانجی ئاسوودەیی مرۆڤی لە ئەستۆ گرتووە . ئەم ئامانجەش بە بێ دەسەڵاتێ خوا ویست و حەق ویست نایەتەدی؛هەروەك نوسەر وتەیەکی ئیمامی( غەزالی ) ( بە رەحمەت بێت) وەك بەڵگە دەهێنێتەوە کە دەڵێت:

( اعلم ان الشريعة اصل ، والملك – الحكم – حارس ، ومالا أصل له فمهدوم ومالا حارس له فضائع ) .

لقی دووەم : کاری کرداری لە ژیانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و

خەلیفەکانی :

خاڵێکی تر لە بەڵگە زیندووەکانی نوسەر لە پەیوەندی ئاین و دەوڵەت لە ئیسلامدا، هەوڵدانی پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ دۆزینەوەی مەئوایەك بۆ رزگارکردنی هاوەڵان لە جەور و ستەمی قورەیشیەکان و بەستنی پەیمانی عەقەبە و دروستکردنی شانەیەکی نۆ کەسی لە هەردوو هۆزی (اوس وخزرج) و نەهێشتنی چینایەتی، وەکو سەرەتایەك بۆ دروستکردنی پێکهاتەی دەوڵەت و پاشان دروستکردنی دەستووری مەدینە .

نوسەر باس لە کتێبی ( تخريج الدلالات السنيه ) ە ی ئیمامی ( عەلی بن محمد الخزاعی ) دەکات کە گرنگی داوە بە حکومەتی ( مەدینە )، بۆیە جێ خۆیەتی وەکو نمونە کردارەکانی باس بکەین :

- کردنی ( ابو بکری صدیق و عومەری کوڕی خەتاب ) رەزای خوایان لێ بێ بە وەزیری کاروباری خەڵکی .
- پاراستنی نهێنیەکان و لە ئەستۆی حوزەیفەی کوڕی یەمان ( رەزای خوای لەسەر ) .
- رێکخستنی سەردانی خەڵکی بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە لایەن ئەنەسی کوڕی مالیك و رەباحی کوڕی مەسروحەوە بەڕێوە دەچوو .
- دانانی عوبادەی کوڕی سامت بۆ فێرکردنی قورئانی پیرۆز و هەستانی عەبدوڵای کوڕی سەعید ئەلعاصی بە فێرکردنی نوسین و دروستکردنی یەکەم قوتابخانەی فێرکاری لە دوای جەنگی بەدر .
- دروستکردنی لیژنەیەك بۆ نوسینەوە لە ( ابی کعب – زید بن سابت )

- دانانی نوسەرانی پەیمان و ئاشتی لە ( علی بن ابی تالیب – عامر ابن زهره – ابو بکری صدیق ) .
- دامەزراندنی ( حقیب ابی فاتمه الدوسی ) وەك سەرپەرشتیاری مۆرکردن .
- بوونی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم )خۆی وەکو لێپرسینەوە .
- دانانی ( ابو عبیده – معاز بن جبل ) وەکو تۆمارکار و پارێزەرانی سەر سنوور هەڵوسرانی زەکات .

کارەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە بواری دەرەوە، ردوانە کردنی نوێنەر و سەفیرەکانی بۆ لای پاشاکانی ( قەیسەر ، کیسری ، نەجاشی، هتد ...)،وە ناردنی نامە بۆیان کە دکتۆر ( محمد حمید الله ابادی ) لە کتێبەکەی ( مجموعة الوثائق السیاسیة علی عهد النبوة ) کۆی کردووەتەوە و بلاّوی کردووەتەوە

( زید بن ثابت ) ی راسپاردووە بە وەرگێڕانی ئەو نامەیەی ئاراستەی کراوە و، پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەر خۆی بەشداری زیاتر لە نۆزدە شەڕی کردووە

بوونی ئیسلام وەکو ئاین لە دوای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین و دوایش هەر بنەمەی دەولەت و بەڕێوەبردنی ژیانی خەلّکی بووە کە هەمیشە بە یەکسانی ژیاون، لە کاتێکدا خەلّکانی ئەوروپا لەوپەڕی جەور و ستەمکاریدا دەژیان، چونکە بەرنامەکانی کلّێسا بیری سەرگەورە و دارێژەرانی بەرژەوەندی خوازی بوو .

بەشی دووەم : ئاین و دەولەت لای ئەوروپیەکان

لقی یەکەم : کلّێسا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

نوسەر بەلّگەیەکی ئاشکرای بەرچاو روونی کردووەتەوە دەسپێکی بنەماکانی دەولەتی مەسیحیەت، کە عیسای پێغەمبەر ( علیه السلام ) لە سەردەمی خۆیدا ناوچەیەکی نەبووە دەسەلاّتی ئاینی تیادا بچەسپێنێت و پەیامەکەی بواری ئامۆژگاری و دورکەوتنەوە لەو خراپەکاریانەی گرتبووەوە کە دەبێتە مایەی خراپەی دەروونەکان .

گەیشتنە دەسەلاّتی مەسیحیەکان پاش سێ سەدە لە تێپەڕبوون بەسەر پەیامی ئاینی مەسیحی بوو، هیچ بەندێکی نەبوو تاوەکو قەوارەی سیاسی و سەربەخۆی بە خۆی هەبێت و شوێنەواری ئامۆژگارییەکانی مەسیح ( علیه السلام ) تیایدا نەما بوو،

هەروەك لە ( دائرة المعارف البريطانية ) هاتووە دەڵێت : ( لم يبق من اعمال السيد المسيح شيء و لا كلمة واحدة مكتوبة ) .
واتا: هیچ شتێك لە كار و كردەوەی مەسیحی گەورە نیە نوسرابێتەوە و كە هی سەردەمی خۆی بێ .
لە بەرامبەر جەور و ستەمی كڵێسادا كەس بۆی نەبوو رایەكی هەبێت و بەربەستی داواكاریەكانیان بێت، چونكە سەرانەی زۆر و باج و توند و تیژی خۆرسكی ژیانی گۆڕی بوو، پاشەڕۆژی سەدان كەسی وەكو قەشە ( ویكلیف ) بە ئازاردا برد، كە رەخنەی ئاراستەی كڵێسادا كرد لەبارەی خراپەكارییەكانی پیاوانی ئاینی و دەمارگیری و گەمژەیەتی كڵێسا و دوای سزای كوشتنی سوتێنرا !
ئەلەم ئەنجامەدا رواڵەتی بێزراوی ئاین و بە دیكتاتۆری بوونی دەركەوت و خەڵكی ئاڕاستەی ماددێتی بەلاوە گرنگتر بوو، هەروەك نوسەر وتەیەكی ( داربر ) لە ( الصراع بين الدين و السلم ) دەهێنێتەوە كە دەڵێت:
( بەهۆی رەهبانیەت و سیستەمی دژە ژیاریانەی ئایین، لادان دەخاتە مەڵبەندی ئاینەكانەوە و وەهای لێ دەكات لە پڕوپاگەندە و خراپەكاریدا پێشبڕكێی رەوتە دونیاییەكان بكات ) .
لقی دووەم : كڵێسا لە سەردەمی رێنیسانسدا ( عصر النهضة )
لەم سەروبەرەی تاوانكاری كڵێسادا رەوتێكی نوێ هاتە كایەوە كە زۆر رەهەندی لە خۆ گرتبوو، مەیدانێكی زانستی هەمەجۆری خستە ئاراوە و چەندین زانا بوونە پێشەنگی رەوتەكان لە پێناو دۆزینەوەی رێگە چارەیەك دەسەڵاتی كڵێسا بخەنە پەراوێزەوە و ستەمگەرایی ئاینی مەسیحی بنەبڕ بكرێت، سەدەی شانزەی زاینی سەدەی تەقینەوەی رەوتەكان بوو، هەر لەم سەردەمەدا بزوتنەوەی پرۆتستانت بە سەرۆكایەتی ( مارتن لۆسەر ) دروست بوو، لە ئەنجامدا بوویە درزێك ( كەلێن ) ی لە بیر و باوەڕێ هەمە چەشنەی مەسیحیەت ئەم سەدەیەش بووە سەدەی رزگاربوون لە دەسەڵاتی كڵێسا

هەر لەم باسەدا جیاوازیەکانی ئاینی ئیسلام و مەسیحیەتی وەکو بەراوردێك ئاماژە پێداوە تاوەکو ئەو گومانە پوچەڵ بکاتەوە کە کەسانی بەناو رۆشنبیر دەیانەوێت دژی ئیسلام بوەستنەوە بێ ئەوەی خوێندنەوەیەکی ویژدانی بکەن و ملکەچی راستیەکان بن کە بەم شێوەیەیە

١. بەڵگەیەکی مێژوویی نیە ئینجیلی ئێستا و سەردەمی عیسا ( علیە السلام )بەیەکەوە ببەستێتەوە، بەڵام قورئان کە پەیامی ئیسلامە و ئێستا لەبەردەستماندایە، هەمان قورئانی سەردەمی پێغەمبەری خوایە

٢. ( صلى الله علیە وسلم ) و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە تاوەکو نەبێتە بنەمای دەوڵەت

٣. مەسیحیەت لە سەرەتادا یاسا و بەڕێوەبردنی کارەکانی ژیانی بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بە جێ هێشتبوو، بنەمایەکی سیاسی نەبوو دوای سێ سەدە دەسەڵاتیان گرتە دەست و مافی پەروەردگاریان لێ جیا کردەوە کە دروشمی ( ما لله لله و ما لیقصر لیقصر ) بوو . بەڵام ئیسلام لە کۆمەڵگەیەکی ( بدوی ) سەرەتاییدا گەشەی کرد و یاسا و بارێکی ئەوتۆی نەبوو لە ناوچەکەدا بە بەراورد لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا، بۆیە دروستکردنی ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو ئەیەوێت خۆی لە ئەستۆی گرت و سیستەم و یاسای داڕشت، وە هەر خۆی ( ئیسلام ) ویژدان و رۆح و مامەڵە و هەڵسوکەوتی بونیاتنان وئاین و دونیای لە ئاراستە و تەشریعاتەکەیدا کۆکردەوە .

٤. داواکردنی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەتی لە مێژووی کڵێسادا دەگەڕێتەوە بۆ باری یەکەمی لە ئەنجامی لادان لە ( مبدء ) و رەفتاری ناشیرینانە، چونکە دەوڵەت و بنەماکانی لە بانگەوازی عیسا ( علیە السلام ) نەبوو، بەڵام لە ئیسلامدا بانگەوازکردن بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت لادانە لە حەقیقەتی ئیسلام، باسی جیاکردنەوەی

ئاین له هەندێك قۆناغەكانی مێژوودا به ئازار و چەرمەسەی شكایەوە سەر موسڵمانان .

5. جیاكردنـەوەی ئـاین لـه دەوڵـەت لـه مێـژووی ئـەورووپاو سـەردەمی رێنیسانس بوورەتـه مایـەی گەشـەی ئـازادی و دەسـەڵات و زاڵبـوونی جیهانی و جـوڵانی پاشـەڕۆژی جیهـان، بـەڵام لـه مێـژووی ئیسلامدا گەشترین سەردەمەكانی شارستانیەت و سـەربەرزی و هێـز و برایـەتی مرۆڤایـەتی لـەو سـەردەمەدا بـووە كـه دەوڵەتەكـەی لەسـەر بنـەمای شەریعەتەكەی بووە

6. لـه یەكـدانی ئـاین و دەوڵـەت لـه ئـەورووپادا داپڵۆسـینی فیكـری و خنكانـدنی ئازادییـەكان و دروسـت بـوونی جـەنگ و ملكـەچ كردنـی خـەڵكی و دێوەزمـەی ئەفسانەیی و نەفامانـە و رەشـبینی خستەوە، بـەڵام پەیوەسـتەیی دەوڵـەت به ئاینـەوە لـه سـەردەمە گوڵاوییـەكانی ئیسلامدا بووتە جێی چەسپاندن و هاتنەوەی كەرامـەتی ئینسانیەت و دادی كۆمەڵایـەتی نێـوان گـەلان و جوڵـەی فیكـری و پاراسـتنی ئازادی ئاینەكان و بڵاو كردنەوەی ئاشتی نێوان گەلان و نەوەی ئاینە جیاوازەكان و، رزگـاركردنی خـەڵكی لـه واهیمـەی ئەفسانە و هیچ و پوچی

7. پەیوەندی ئاین به دەوڵەتەوە له ئەورووپادا و له سەدەكانی ناوەڕاست، پیـاوە ئاینیـەكانی ( الرجـال الـدین ) كـردە چینێكی دەسـەڵاتدار و داپڵۆسێنەر، بەڵام پەیوەندی ئاین و دەوڵـەت لـه سـەردەمی ئیسلامدا داد و یەكسانی هەڵـدەدات و نمونـەی زانایـانی ئیـسلام بوونەتـه داینەمۆی ئازادی گەلان به درێژایی مێژوو

جـۆن وبـستر ئـەڵێ دەردەكـەوێت كـه رۆژئـاوای مەسـیحی هـەر لـه سـەردەمی جەنگـە خاچپەرستەكانەوە پلانـی وەرگرتـووە لەسـەر بێ دەنگی تـەواو بەرامبـەر جوانیـەكانی ئیسلام و، بـه جۆرەهـا رێگـەی جیاواز هـەوڵی شێواندنی بنەماكانی داوە .

سیر عبدالله رشبالد هاملتونیش دەڵێ : هیچ ئاینێك نیە بە قەد ئیسلام خراپ لێی گەیەنرابێ و لە لایەن نەزان و دەمارگیرەکانەوە بە قەد ئیسلام هێرشی کرابێتە سەر، ئێجگار دوژمنایەتی دەکرێت [1]

لە پاڵ بڵاوکردنەوەی ئەوهەموو کتێب و نامیلکە و بەرنامە رادیۆیی و تەلەفزیۆنیەکانەوە کە راستەخۆ هێرش دەکرێتە سەر ئیسلام، ئەوە هەوڵێکی زۆر لە ئارادایە کە گاور و جولەکەکان دەیدەن تاوەکو ئیسلام و موسڵمانان وەکو وێنەی تیرۆر و تیرۆریستان پیشان بدەن [2]

جاك مندلسۆنی بە گاورکاری ئەمریکی ئەڵێ : بە راستی هەوڵگەلێکی چالاکانە دراوە بۆ بەکارهێنانی موژدەدەران، ئەوەش نەك لە بەرژەوەندی کلێسادا، بەڵکو بۆ خزمەتی داگیرکاری و بە کۆیلە کردن .بە راستی پەیامێك کە زۆر وێرانە بەخۆوە دی بێ، دەبێ وەها پەیام و ئامۆژگاریەکی هەڵنەگرتبێ باس لە پاراستنی ئەخلاق بکات

ولیەم میور ئەڵێ : قورئان تاکە کتێبێکە بۆ ماوەیەی دوانزە سەدە بەبێ دەستکاری و گۆڕانکاری تیا کردن ما بێتەوە [3]

باوەڕی ئیسلام کە پەیوەستە بە قورئانەوە، رووبەڕووی غەزوی فیکری و داگیرکاری دەبێتەوە، هەروەکو د . عمادالدین خلیل ئەڵێ : ئەو بیر و باوەڕەی کە هەمانە و ئەو روناکبیریەی کە لە مێژووە دوور و درێژەکەماندا لەو بیر و باوەڕەوە دروست بووە، زۆر بەرز و باڵاترە و ناکرێت بە بیر و باوەڕ و فەلسەفە و بیریار و ناوەڕەکە روناکبیرەکەیان بەراوردبکرێت، ئەوە خۆیان چەندین جار دەیڵێن و دووپاتی دەکەنەوە، پێش ئەوەی ئێمە دووپاتی بکەینەوە [4]

عەلی عەبدولڕەزاق و هاوشێوەکانی لە نێو نەتەوەی موسڵماناندا .

---

[1] الشرباصی ، احمد : یسالونك في الدین و الحیاة ، ج ۷ ، لا ٦٦١

[2] براون ، بربار : نظرة عن قرب في المسیحیة ، لا ۹۲

[3] بڕوانە کتێبی ( هل کتاب المقدس کلام الرب ) احمد دیدات .

[4] د . عمادالدین خلیل : حول إعادە کتابە التاریخ الاسلامی ، لا ۱۰

من بۆ وەها باسێك و نوسینەوەی لە دوو توێی ئەم کتێبەدا دوو دڵیەك نابینم، بەقەد ئەوەی لە مێژووی نەتەوە ئاینزاکانی تردا دژایەتی بۆ ئیسلام هەیە، ئاوەهاش کەسانێکی مەلاس خواردووش هەن لە ناوەوەی ئەم کۆمەڵگە ئیسلامیەدا خەریکی دروست کردنی چەندان بیری کرمۆڵ و تۆڕی ئاژاوەگێڕی فیکرین و هەوڵی سەوداگیری بۆ دەدەن و لە رێگەی کۆڕ و سیمینار و نوسینی رۆژنامە و گۆڤار و کەناڵەکانی راگەیاندنەوە کە بە هەموو جۆرێك ئامرازەکانی گەیاندنیان بۆ رەخسێنراوە و بوارێکی زۆری ماددی و مەعنەویان خراوەتە بەر دەست، لە هەوڵدان بۆ لەرزۆك کردنی بیر وباوەڕی موسڵمانان و داڕنینیان لە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلام، ئەوەش لە کار و کردەوەیان و زمانی ئاخاوتن و هەناسەی سواویانەوە زۆر بە جوانی دەردەکەوێت .

( علی عبدالرزاق ) ی خاوەن کتێبی ( الاسلام و اصول الحکم ) یەکێکە لەو کرمۆڵانەی بە شان و باڵیدا گۆرانی دەوترێت باشتر وایە بزانین ئەم کابرایە کێیە ؟ ئایا دەتوانێت ببێتە جێی باوەڕی راستگۆیان و بە درۆ نەخرێتەوە ! ؟ ئەم پیاوە لە ( صعید ) ی میسر لە خێزانێکی پادشا و دەسەلاتدار لە دایك بووە و باوکی کاری سیاسی کردووە و جێگری سەرۆکی ( حزب الامە )بووە، ئەو حیزبە بووە کە لە ساڵی ١٩٠٧ ز لە ژێر چاودێری ( لورد کرومر ) دروست کراوە و باوکیشی پەیوەندییەکی توند و تۆڵی لەگەڵ ئینگلیزدا هەبووە، ئەم ( علی ) ە ساڵی ١٩١١ خوێندنی لە ئەزهەر تەواو کردووە پاشان بۆ ئینگلترا گەشتی کردووە بە مەبەستی خوێندنی سیاسی و ئابووری، بەڵام بەهۆی هەڵایسانی جەنگی جیهانی یەکەمەوە نەیخوێندووە و گەڕاوەتەوە میسر و لە ساڵی ١٩١٥ ز لە ( محاکم الشرعیە ) کراوە بە دادوەر .

پاش جەنگی جیهانی حیزبێکی نوێ دروست بوو بەنێوی ( حزب الاحرار الدستوریین ) کە درێژە پێدەری ( حزب الامە ) ی کۆن بوو، ئەمجارەش لەژێر چاودێری (لورد لنبی ) گەشەی کرد و دامەزرێنەرەکەی ( حسن پاشا عبدالرزاق الضمیر ) برای عەلی عەبدولڕەزاق بوو، وە بنەماڵە دەرەبەگایەتیەکەی ئاراستەکاری سیاسی حیزب بوون .

ڕەوتی ئیسلام خوازی موسڵمانان دژ بە داگیرکاران بوون و یەکبوونی خاکی موسڵمانانیان بەلاوە مەبەست بووە، چونکە دەیانزانی داگیرکاران دەیانەوێت بە لەتکردنی قەوارەی دەوڵەتی ئیسلامی خۆیان بالاْ دەست بکەن ، بنەماڵەکەی ( عبدالرزاق ) لایەنگیر و پشتیوانیان ئینگلیزەکان بوون، بۆیە ئەم پیاوەش هەستاو کۆڵی پیلانەکانی لە شانی خۆی ناو بیرۆکەی ڕۆژئاوای بە بەرگێکی نوێوە هێناو ئیسلام و مەسیحیەتی بە یەك چاوێلکە پێوا نوسەر هەندێ لە قسەکانی بە نمونە دەهێنێتەوە کە دەڵێت ( لقد انتهت الرساله بموته ( صلى الله عيله و سلم ) فأنتهت الزعامة ايضا ) گێل و بێ فامیەتی ئەم پیاوە بە ئاسانی دەرکی پێدەکرێ، چونکە ئەم پەیامە هیچ سەردەمێك لەکەدار نەبووە ، پێغەمبەر ( صلى الله عيله و سلم ) بەرنامەیەکی تەواو پوختی پێشکەش کردین و گەڕانەوە بۆ قورئان باشترین بەڵگەیە و شیاوی دەسەڵاتداریە

ئەو گومانانە لەلایەن هاوبیرەکانیەوە خوێندنی ئیجابی بۆ دەکرا و ئافەرینیان بۆ دەکرد، بۆیە موفتی میسر ( شيخ محمد بخيت الطيعي ) بەرپەرچی دایەوە و ( هيئە الكبار العلمە ) ش بە سەرۆکایەتی شەیخی ئەزهەر (محمد ابی النضل ) على عبدالرزاق لە کۆڕی زانایان دوورخرایەوە. على عبدالرزاق زۆری دەوت لەسەر پەیوەندی ئاینی ئیسلام و سیاسەت و بێ ئاگابوو لە کتێبەکانی ئیمامی ماوەردی و غەزالی خراء و ابن حزم و سائی وابو جند منصور کە لەبارەی سیاسەتی شەرعی نوسراون و ئیمامی ئیبن

تەیمیەش کتێبی ( اصلاح الراعی و الرعیه ) بۆ ئەو باسە تایبەت دەکات ،
ئەم کتێبانە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت نوسراون،
نەك بەڕێوەبردنی مزگەوت بە تەنیا ، بیر و بۆچوونەکانی ئەو مەرامانەی لە
خۆ گرتبوو کە ( احمد لوتفی ) درکاندنی لە کتێبەکەیدا بە ناوی ( سیاسة
المنافع لا سیاسة المصالح ) بڵاویکردەوە .

بەشی سێ یەم : هەڵوەشاندنەوەی پیلانەکان و بەرپەرچدانەوە یاخود
ئاراستەی بەرگریکار

هێزە داگیرکارەکان جۆرە ئالیەتی دوژمنکارانەیان بەکار دەهێنا و بە
کرێ گیراوانی ئەلقە لە گوێی زۆری ڕێکدەخست و پرسیاری جۆراوجۆریان
دەوروژاند، هەوڵدانی کرمەکانی نێو خۆی جەستەی خاکی ئیسلامی گومانی
گەورەیان دەخستە نێو کۆڕی خەڵکی و هێرشیان دەکردە سەر ئیسلام و بە
فاکتەری ملکەچی تاوانبار دەکرد، لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا گەلانی موسڵمان
لەسەروی هەمووشیانەوە زانا پایە بەرز و قەڵا نەبەردەکانی وەڵامی
گومانەکانیانی دەدایەوە و تێدەکۆشان و مەرامی داگیرکاریان پوچەڵ
دەکردەوە، وەکو زانا شێخ مستەفا صەبری و محمد رشید رەزا لە کتێب و
نوسراوەکانیان بەرگری لە رەسەنێتی ئیسلام و شارستانیەتەکەیان دەکرد،
دکتۆر مصطفی السباعی کتێبی ( حضارة الاسلام ) ی بە چاپ گەیاند و
دیکۆمێنتی زانستی دەخستە روو، نەمری ئەم ئاینەیان دەسەلماند، نوسەر
نمونەی زۆری هێناوەتەوە وهەوڵی زانایانی نرخاندووە لەگەڵ ئەو هێرشە
بێ بەزەییانەی داگیرکەران زانایانی موسڵمانان چۆکیان دانەدا و لەگەڵ
ئەوەی موسڵماناندا دەژیان،لە نێو ئازاردا تەمەنیان بەڕێدەکرد،کاتێك( ریان )
ی راوێژکاری وەزیری دەرەوەی فەرەنسا لە ( سوربون ) باسێکی بە
ناونیشانی ( الاسلام و السلم ) وتبوویەوە، شێخ محمد عبده لە وەڵامیدا
کتێبی ( الاسلام والنصرانیه مع العلم والمدنیه ) ی بڵاو کردەوە و لە دوو
توێیدا زانستی و واقیعێتی پەیامی ئیسلامی خستە روو .

جا سەیر لەوەدایە دوای چەندین ساڵ بەسەر دەرچوواندنی ئەو کتێبە و هاوشێوەکانی! ئێستاش وەها باسێك لە بڕوا...یە و ...یان و سەدان دەزگای ناوخۆ و دەرەوەی کۆمەڵگەی موسڵمانان لە باسی بە باڵا دەستی ئیسلام چاوی هەڵنایەت و بە دەیان ئامرازی جۆر بە جۆر لە هەوڵی کەنارخستنی ئیسلامدایە لە ژیان، تاوەکو هەر لە سوچی مزگەوتێکی بێ ئازدا بمێنێتەوە کە خەڵکی بە خۆیان لە هەوڵی دروستکردنی دان !

لە کوردستانیشدا بە بینراو و بیستراو و نوسراویش لەسەر ئەم بابەتە قسەی زۆر کراوە و دەکرێت، یەکێك لەو بابەتە نوسراوانەش، کتێبی ( ئیسلامی سیاسی ) شوان ئەحمەدە،لەو کتێبەیەدا کۆکردنەوەیەکی زۆر دارێژاوە و پوختە لەو بابەتانەدا ئەوەیە کە ئیسلام شیاوی هیچ دەسەڵاتێك نیە، وەکو قسەیەکی ئەحمەد بەغدادی باس کردووە کە : خەلافەت جگە لە ماڵوێرانی و دواکەوتوویی و مەرگە سات نەبێت ، هیچی دیکەی بۆ ئەو خەڵکە بێ چارەیەی دەستەبەر نەکرد بوو، لە قسەیەکی وەها بێ ئینسافیەکی زۆر دەبینین، بەجۆرێك جگە لە هەندێ داخ لە دڵی رۆژئاوایی دەنا کەسانێکی زۆر شایەتی پێشکەوتنی مرۆیی ژیاری ئیسلامین کە لە ساسیەی ئەو خیلافاتانەدا هاتنە کایەوە کە ئەو بە مەرگە سات ناوی بردوون .

( غۆستاف لوبون ) ی زانای ئەوروپی کە دوژمنایەتیەکی سەرسەختانەی دژ بە ئیسلام هەیە دەڵێ : ژیاری ئیسلامی کاریگەریەکی گەورەی لە جیهاندا هەبووە، ئەم کاریگەریەش بە فەزڵی عەرەب و نەتەوەکانی دیکەی ئیسلامیەوەیە، بە هێزی ئەدەبیانەوە گەلە بەربەرەکانیان چاك کرد کە ئەمپراتۆیەتی رۆمانیان لەنێو برد، بە کاریگەی عەقڵیشیان جیهانی زانستی و ئەدەبی و فەلسەفیان بۆ ئەوروپا کردەوە، ئەوەشە ئێمە لەبیری دەکەین، بۆیە عەرەب بۆ ماوەی شەش سەد ساڵ مامۆستای ئێمە بوونە

ئەوە شایەتیەك بوو، بەڵام من دەپرسم ئاخۆ گەر دەسەڵاتی خیلافەت نەبووایە کێ ئەو ژیارەی دروست دەکرد ؟ گەر دەسەڵات نەبووایە کێ ئەندەلوسی فەتح دەکرد و مەعریفە و لێبوردەیی ئیسلامی دەکردە تۆوی ئەو

ژیارە دەوڵەمەندەی سەدانی وەکو غۆستاف باسی دەکەن ؟ ئەی کێ بەغدای دەکردە پایەختی زانستی سەردەمی خۆی ؟ !

لە زۆرێک بابەتی کەسە عەلمانیەکاندا نابینم گەورە بە زانا موسڵمانەکاندا چ کۆن و چ نوێ هەڵدرابێ، هەمیشە هەوڵدراوە لە پایەی رێز و زانستیان کەم بکرێتەوە، حکومەت و حیزبە عەلمانیەکان زۆر جار سانسۆریان خستووەتەسەر ئەو بەرهەمە زانستیانەی پێگەی دەوڵەتی و دەسەڵاتی ئیسلام دەسەلمێنن، ئەوەش وەنەبێ بە ئەشکەنجە و سوچی زیندانەکان بووبێ، بەڵکو بە زۆری دەزگا ئیعلامیەکانیان زۆر باش بە گەڕ خستووە بۆ سووککردنی ئەو بابەتانەی کەسێکی پەیوەست بە ئیسلام نوسیوێتی یان کەسێکی جگە لە ئیسلام و راستگۆیانە چارەسەی سیستەمی ئیسلامیان دەرخستووە لە هێنانەوەی دادگەری کۆمەڵایەتی و چارەسەی دەردی فیکری و راستکردنەوەی بەهای مرۆڤ و رێزی ئازادیەکانیان .

عەلی عەبدولرەزاقی گۆشکراوی نێو بنەماڵەیەکی بریتانی پەروەردەکراو لای نوسەرانێك ! بە شێخ بانگ دەکرێ وناودەهێنرێت !

لە کتێبی ( ئیسلامی سیاسی ) دا هاتووە کە شێخ عەلی عەبدولرەزاق لەرێی شاکارە دەگمەنەکەیەوە ( الاسلام و اصول الحکم ) بەرپەرچی هەموو ئەوانە دەداتەوە کە خەلافەت بە واجبێکی ئاینی و روکنێك لە روکنەکانی ئاینی ئیسلامی دادەنێن [1]

بۆ وەڵامی ئەو قسەیەی کە کاکە شێخ، پێشتر باسمان لە یاساکانی ئیسلام کرد، بەڵام لێرەشدا دەبێ ئەوە روون بکرێتەوە کە ئیسلام تەنیا بڕیاری لەسەر نوێژ و رۆژ کردن نەداوە، کە باس لە ( قصاص ) تۆڵە سەندنەوەی بکوژ دەکات دەبێ دادگایەك هەبێ-وەکو ئەوەی لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا هەبووە و بڕیاری لەسەر داوە و دەسەڵات ئەو کارەی

---

[1] شوان ئەحمەد : ئیسلامی سیاسی ، ل ١٠٢ ، ٢٠٠٤ سلێمانی .

ڕاپەڕاندووە، خۆ بڕیاری سەر کەسانێکیش هەیە داوێن پیسی بکەن و بڕیاری قورئانیان لەسەر هەیە، ئەی جیهاد و سەلماندنی ئایینی خوا کێ دەیکات ؟ ! تاک یان دەسەڵات، ئیسلام هەر لە سەرەتاوە ئاس و دەسەڵاتی سەر زەوی تەنیا بۆ خوای بە شیاو زانیوە، دەسەڵات مرۆڤەکان رای دەپەڕێنن و بنەماکانی خوایین، رووداني هەڵە لە تاکەکانەوەیە نەک ئاینەکە، قودسیەت بۆ ئاینەکەیە نەک دەوڵەت و خەلیفەکە، هەروەکو ئەبو بەکری پێشەوا ( ر خ ) دەفەرمووێت : گەر لە بڕیارەکانـدا پێکام ئـەوە گوێڕایـەڵیم بکـەن گـەر نـا گوێڕایەڵی کردنتـان لەسـەر پێویـست نیـە، هـاوەڵانیش وتیان بـەم شمشێرە راستی دەکەینەوە گەر لە فەرمایشتی خوا و پێغەمبەرەکەی لاتدا .

هەر بە ماوەیەکی کەم چەند کۆمەڵێك لە پێدانی زەکات پەشیمان بوونەوە، بەو هۆیەوە جەنگی هەڵگەڕاوەکان روویدا و ئەبو بەکری سدیق بڕیاردەری بوو، هـاوەڵانیش گوێڕایـەڵی بـوون، دەبـێ عـەلی عەبدولڕەزاق و پشت گیرە سەرسەختەکانی کە کەنارگیری ئیسلامیان دەوێت چۆن لە وەها نمونەیەك خۆ قوتـار بـدەن ؟ئـاخۆ بـۆ سـەلامەت هێشتنەوەی ئـەو حوکمـە شـەرعیانە دەسەڵات پێویست نیە ؟! ئایا دەسەڵاتی عەلمانی چۆن قودسیەتێك بە خوا بەدات، سیستەمی زەکاتی بۆ دەپارێزێ و هەموو ئەوانەی باسمان کرد لە نیکاح و میرات و قیصاص و حدودەکاندا فرمانی خوا دەخاتە سەرەوەی یان فرمانی دەسەڵاتداری بەرژەوەندی خوازی خۆ سەپێن بەسەر مرۆڤەکاندا جێ بەجێ دەکـات ؟ ! زۆرێـك بـاس لـە عـەلی عەبدولڕەزاق دەکـرێ، بـەڵام قـەت نەوتراوە ئەو پیاوە بۆ خوێندنی سیاسی و ئابووری رووی لە ئینگلترا ناوە و لە وێش لـە بەرامبـەردا بـۆ لاواز خـستنی بـاوەڕی موسڵمانان بـە دەسـەڵاتی سیاسی ئیسلام بەڵێنی دەسەڵاتدارێتی بنەماڵەکەی پێ دراوە و بە چاویش بەرهەمی ئەو بەڵێنەی بینیوە

د . عمر فروخ ئـەو کاتـە دەگێڕێتـەوە کـە لـە پـاریس خوێندوویـەتی و ئـەڵێ دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٣ لە لە پاریس لای ماسینیوس و مارسیە ولیفی پرۆڤنسال بووم بۆ ماوەیەك، دوای ئـەوەی ویـستم بکـەڕێمـەوە ئـەڵمانیا بـۆ

خوێندنەکەم و خواحافیزیم لە مامۆستاکان کرد، پێش ئەوەی زانکۆی سۆربوون بەجێ بهێڵم مارسیە ویستی قسەم لەگەڵدا بکات،

بۆیە وتی : عمر تۆ لە ئەڵمانیا بۆ خوێندنەکەت پارەدەدەیت و بۆ بژێویت خەرج دەکەی، وەرە لای ئێمە بێ بەرامبەر بخوێنە و هاوکاریت دەکەین و پاشان دەگەڕێیتەوە بەیروت دەبینی چ پلەیەك چاوەڕێتە

د . عمر فروخ لەسەر ئەو قسەیە دەڵێ : تازە ئێستا هیچ پێویستیەك نیە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو سوکایەتیە، بەڵام دەمەوێ بڵێم : کەسانێك دەناسم لە فەرەنسا و جگە فرنسا خوێندیان و کاتێك کە گەڕانەوە بەیروت و جگە لە بەیروت بینیان کۆمەڵە پلە و پایەیەك چاوەڕێیان دەکات، ئەوەی کە رۆژهەلاتناس و گاورەکان نەیانتووانی بیکەن ئەوان کردیان و خراپەکاریەکانیان زیاد کرد [1]

بۆیە ئەوانەی بە وەها بۆچوونێك کاریگەر بوون، بەرژەوەندی وەهای لێکردن ستەمێکی گەورە بەرامبەر کۆمەڵگاکانیان بکەن ، پێنوس بۆ جگە لە حەقیقەت هەڵبگرن ، هەروەکو د. مایکل هارت دەڵێ : موحەممەد ( د . خ ) دامەزرێنەر و بلاوکەرەوەی یەکێ لە هەرە مەزنترین ئاینی سەرزەمینە، دادەنرێ بە یەکێ لە هەرە سیاسیە مەزنەکانی جیهان [2]

د. مایکل هارت هەر لە بارەی موحەممەدی پەیامبەرەوە(صلی الله علیە السلام) دەڵێ: لەو هۆیانەی موحەممەد ( د خ ) لە عیسا جیا دەکاتەوە، ئەوەیە موحەممەد ( د خ )چەنێ پێشەوایەکی ئاینی بووە ئەوەندەش پێشەوایەکی جیهانی بووە، ئەو هێزە پاڵدەرانەش دوای دەسەلاتگیری ئیسلامەکان بەڵگەیەکن بۆ ئەم راستیە. لێرەدا گەر بە وردی چاوێکی بایەخ پێدانەوەش

---

[1] مجلة التوحيد : قراءة في كتاب : الفكر الاستشراقي تاريخه و تقويمه ، العدد ٨٨ ، محرم ١٤١٨ هـ.

[2] ١٠٠ ناودار : د . مایکل هارت ، و . ئەسعەد قەرەداغی ، لا ١٣ .

سەرنج بدرێت دەردەکەوێت کە موحەممەد ( د.خ )بە مەزنترین پێشەوای سیاسی دادەنرێت هەتا هەتایە[٣]

ئەوە قسەی کەسێکە خوێندنی لە وڵاتی موسڵمانان تەواو نەکردووە و موسڵمانیش پارەی خوێندنەکەی بۆ نەداوە تاوەکو تاریکانە قەڵەم بە دەستەوە بگرێ ! باسی لە ژیانی سەد کەس کردووە کە زۆربەیان سەرسەختانە بیر و باوەڕی دژ بە ئیسلامیان هەبووە، بەڵام هاتووە راستگۆیانە و واقیعیانە لەسەریان دواوە، دەزانی کە ئیسلام لە رێگەی قورئان و فەرموودەوە داوای دەروونی پاك و کۆمەڵگەی راستگۆ و پاکی دەکات، دەسەڵاتێکیش پەیرەو دەکات لە نەهێشتنی تاوانی کوشتن و داوێن پیسی و دزی و رێگری و مامەڵەی ئابووری نا پەسەند و ئەتککردنی شکۆی مرۆڤەکان، بەڵام ئەوەی لەبەرامبەر ئیسلامدا چاو دەنوقێنێ و باس لە جیاکردنەوەی ئاین لە دەسەڵات دەکات سەرچاوەکی لە لاوازی ئیرادەی کەسەکەدایە، وەکو ئیبونو خەلدون دەڵێ نەتەوەی تێك شکاو و لاواز دەبێتە لاسایی کەرەوەی نەتەوەی زاڵ . ئەم نەتەوە ئیسلامیەش لە رووی ئاینەوە تێك شکاو نیە ، لە بوارە مادیەکەوە تێك شکاوە و دەرچووانی زانکۆ ئەوروپیەکانی گەڕاوە بۆ ناو کۆمەڵگە کە بە هەستی لاساییکەرەوە گەڕاوەتەوە خەمی لە چارەسەری تەواوی نیە، دەنا ئیسلام بۆ ئەو هەموو ناعەدالەتی و وەکاربردنە مرۆییە بێ ویژدانیە چارەسەری پێ یە، کە برینی دەستی چەوسێنەران و ئەوانەی حەزیان بە داد و مرۆڤدۆستی نیە و نایەوێ مرۆڤەکان وەك برا و لە ماڵ و گەڕەك و شاراندا بە پارێزراوی و ناوبانگی جوانەوە بژین .

---

[٣] هەمان سەرچاوە ، لا ١٩

## رووداوەکان لە رووی سیاسی و جێبەجێکاریدا :

### * ئەتاتورک و هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت :

نوسەر دەڵێت : ئەڵقە لە گوێیەکی وەکو ( ئەتاتورك ) و دەزگاکانی جولەکەی جیهانی دوای چەندین ساڵ توانیان پایەکانی خیلافەت لەرزۆك بکەن و پاشان لە ریشکە دەری بهێنن ، بەمەش نمونەیەکی نوێ لە دەسەڵاتی سیاسی لە ناوچەکەدا هاتە ئاراوە و دەسەڵاتی ئیسلامی گۆڕدرا بۆ دەسەڵاتێکی عەلمانی و خیلافەتی عوسمانی لە ئیمپراتۆریەتەوە کرا بە دەوڵەتی تورکیای بچووك ! و دوژمنایەتی کەوتە نێوان نەتەوەی ئیسلامیی خاوەن ژیاری رەسەن .

### * بەشی دووەم : بەرگری کرداری موسڵمانان لە پاراستنی خیلافەت :

( اسماعيل الكيلاني ) نوسەر بەو پەڕی وردبینیەوە توانیویەتی وێنەیەکی گونجاو بکێشێت بۆ کۆتایی ساڵەکانی خیلافەت، ئەویش لە دروست بوونی ئەو کۆمەڵ و بزوتنەوە ئیسلامیانەی جیهانی ئیسلامی لە پێناو سەر لە نوێ دروست بوونەوەی خیلافەت، بۆ ئەو مەبەستە ئاماژەی بۆ کردوون کە گرنگترینیان برایانی موسڵمانە ( اخوان المسلمين ) کە مامۆستا ( حەسەن بەننا ) دامەزرێنەری بوو، بێگومان ئەم بزوتنەوانە توانیان پایە ئیسلامیەکان بپارێزن و نەوەکان وشیار بکەنەوە و پابەند بن بە رەسەنێتی خۆیانەوە و لە پێناویدا هەزاران قوربانی درا و ( حەسەن بەننا )ش شەهید کرا، کەچی پەیامی ئیسلام هەر بەردەوام بوو !

شوان ئەحمەد لە کتێبی ( ئیسلامی سیاسی ) دا باس لەوە دەکات کە ( حەسەن بەننا ) ئیسلامی ئصولی دەکاتە بەدیل( ئەلتەرناتیف ) ی

سەرمایەداری و سۆسیالیزم و ناسیۆنالیزمی عەلمانی، لە راستیدا ئیسلام گەر حەز بکرێ پێی بوترێت ئصولی و هەر شتێکی تر،

ئەوە خۆی بۆخۆی ئاینێکی پەیڕەوکراو و یاسای تایبەت بە خۆی هەیە، وەکو ئەو قوتابخانە زەمینیانەی تر کە ناویان سەرمایەداری یان ناسیۆنالیزمی عەلمانی چۆن خۆیان بە دیلی یەکتر دەکەن، ئەوە بۆ ئیسلامە کە ئاینێکی ئاسمانی و پارێزەری رۆحی و ماددی مرۆڤە خۆی بە شیاوتر بزانێ تاوەکو سایەی ژیانی مرۆڤەکان بێ.

بۆیە رەخنەی لە چەند پێشنیارێکی بەننا گرتووە کە ئەمانە پێشنیارەکانی بوونە [1]

١. بنەبڕ کردنی دیاردەی لەشفرۆشی و سزادانی تاوان باران لەبەرچاوی خەڵکیدا

٢. قەڵاچۆ کردنی مەی نۆشی، وەك چۆن قەڵاچۆی تلیاك خواردن دەکرێت .

٣. رێگە نەدان بە دیاردەی تەبەروج و هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی خۆ دەرخستن و ( راهێنانی ژنان لەسەر شتە پەسەند و گونجاوەکان ) واتا پۆشینی پۆشاکی لەبار و هەڵسوکەوتی جوان، ئەمە بە تایبەت لای مامۆستایان و خوێندکاران و پزیشکان ) .

٤. چاوخشاندنەوە بە پرۆگرام و بەرنامەکانی خوێندندا و،دانانی بەرنامەی تایبەتی بۆ هەر یەك لە کوڕان و کچان.

---

[1] شوان ئەحمەد ، ئیسلامی سیاسی ، ل ٢٩١ ، ٢٠٠٤ سلێمانی .

٥. رێگەنەدان بە تێکەڵکردنی کوڕ و کچ لە قۆناغەکانی خوێندندا و ( کۆبوونەوەی پیاو و ئافرەتان پیکەوە تاوانێکە نابێت چاوپۆشی لیٚ بکرێت )
٦ وتنەوەی وانەی پەروەردەی ئاینی لە خوێندنگا و زانکۆکاندا
٧. داخستنی ئایت کلاّپەکان ( حەرامکردنی هەموو جۆرە سەما کردن و تێکەڵ بوونێك ) .
٨. چاودێری کردنی ( هۆڵەکانی نواند و فیلمە سینەماییەکان و چاو خستنە سەر شانۆ و فیلم و کتێب و رۆژنامەکان و هەموو ئەو کۆڕ و کۆبوونەوە و سرود و گۆرانیانەی پێشکەش بە میللەت دەکرێت .
٩. پێویستە تەواوی میللەت یەك جۆر جل و بەرگ بپۆشن .

ئەوانەش کە پەیوەندییان بە لایەنی ئابووریەوە هەیە ئەمانەن :
١. زەکات دان بە شێوەیەکی گشتی و رێکوپێك تا کۆمەکی پرۆژە خزمەتگوزاریەکانی پیٚ بکرێت بۆ پیر و پەککەوتە و هەژاران و بەهێزکردنی سوپا
٢. قەدەغەکردنی وەرگرتنی سو لە بەرامبەر قەرزدا
٣. هاندانی پرۆژە ئابووریەکان و دابین کردنی کار بۆ بیٚ کاران .
٤. پاراستنی هاولاّتیان لە ( کۆمپانیا چارچنۆکە مۆنۆپۆلیەکان )
٥. زیادکردنی موچەی فەرمانبەرە بچووکەکان و کەم کردنەوەی موچەی گەورە فەرمانبەران .
٦ برەو دان بە خوێندنی کشتوکاڵی .
٧. گرنگی تایبەت بدرێت بە کاری هونەری و کۆمەلاّیەتی کرێکاران و ئاستی گوزەرانیان باش بکرێت

٨. بەگەڕخستنەوە و بەکارهێنانی ئەو سەرچاوە سروشتیانەی پشت گوێ خراون، وەکو ( کانی و زەوی و کشتوکاڵی و ... هتد ) [٢]

بۆ قسە کردن لەسەر ئەم ( ٩ ) خاڵەی سەرەوە لە ململانێ ی ئەخلاقیدا لەبارەیانەوە قسە کرا، بەس پێویستە لێرەشدا ئەوە بوترێت کێشەکانی ئەو جیهانەی پێ ی دەوترێت جیهانی ئیسلامی لەو بوارانەدایە، داخۆ دەبێ خوێنەر چ عەیبەیەك لەو پێشنیارکراوانەدا ببینێتەوە، ئەوەی ئیمام بەننا داوای کردووە ئێستا هەندێ وڵاتانی ئەورووپا و بە ئەمریکاشەوە لە هەوڵی جێ بەجێکردنیدان، ئەمە چ جەنگێکە و بە هەندێ کەس سپێردراوە بۆ کەنارخستنی ئیسلام ! ؟ لەوەش سەیر تر بزاوتەکەی ئیمام بەننا بە دەستی ئینگلیز زانراوە ! چ ژیریەکە بۆ کەسێك وەها بیر بکاتەوە گەر وەها بووایە دەبوو ئیمام حکومەت بووایە و ئەوانی دیکەش لە ریزی گەل، کەچی بە پێچەوانەوە، حکومەت دروستکراوی بێگانە بوو بۆ لێدانی ویستی ئیسلامدۆستانەی گەلی میسر، بۆ وەها ناوزڕاندنێك سەرسوڕمانی نابینین، چونکە بیر و باوەڕی دەسەڵاتداری ئەمڕۆ دەبێ نامۆ بێ بە بیر و باوەڕی گەل، ئەو نامۆییەش زۆر جار دەیشارنەوە و رەمزەکانی بانگەوازی ئیسلامی دەکەونە بەر لێدان .

ئەوەی تاوانی حەسەن بەننا بوو ببێ تەنیا ئەوەیە ، کە ئیسلام شیاوی دەسەڵاتکردنە .

---

[٢] هەمان سەرچاوە ، لا ٢٩٢

* ژینگەی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامیدا :

لەم بەشەدا نوسەر هەستاوە بە ناساندنێکی بنەتیانەی عەلمانیەت و ئەو ژینگەیەی کە رەخسا تیایدا سەرهەڵ بدات، ئەویش لە ئەوروپا و لە دژی کڵێسا و ستەمەکانی بوو، رووداني شۆڕشی عەلمانیەت لە ئەوروپا فاکتەری خۆی هەبوو خەڵکی پێی هەستا، بەڵام جیهانی ئیسلامی ( مقومات ) ی خۆی هەیە و ئاینی ئیسلامیش واقیعیانە و مامەڵەیەکی گونجاو دەکات لەگەڵ رۆح و عەقڵی مرۆڤدا، پەیامی ئیسلامی پەیامێکی گشتی یە و موڵکی کەسێکی تایبەت نی یە، دارێژەرانی بیری عەلمانیەت تاوەکو ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا نەیانتوانیوە پێناسە راستیەکە بۆ خەڵکی بکەن و رونکردنەوەیەك بەوەشەوە بدەن، خۆیان بە دیندار دەزانن گەرچی خراپەکاریەکی زۆریان بڵاو کردووەتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا تەوژمی ئاینداری هەمیشە زیندووە و مرۆڤ تیایدا مرۆڤە ( خواوەند یاخود ئاژەڵ نی یە ) جیاوازە لە ژینگەی ئەوروپی کڵێسایی، عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامیدا بە زەبری هێز و ترس و داپڵۆسێنەر گەیشت بە دەسەلات، هێزێکی ( ئیستبداد ) یە لە نمونەی دەسەلاتی ( ئەتاتورك و سەدام و شاو هتد ) بۆیە تاوەکو ئێستا نەیتوانیوە وەکو لە ئەوروپادا زاڵە ئاوەهاش دەست بگرێت بەسەر رۆح و جەستەی گەلدا، چونکە ئاینی ئیسلام خۆرسکی ژیانە و رۆح پەروەردە دەکات تاوەکو دەسەلات، پەروەردەی دادپەروەری بێت و مافەکان بناسێتەوە لە کۆتایی کتێبەکەیدا نوسەر لە باسی گرنگترین بەرهەمەکانی لێکۆڵینەوە و پاشەرۆژی جیهانی ئیسلامی ئەدوێت، نوسەر بەشێوەیەکی خێرا باسەکانی پێشتر لە هێرشە سەربازیە خاچپەرستەکان و رۆژهەلاتناس و موژدەدەرەکان دووبارە دەکاتەوە تاوەکو مەبەستەکانی بە روونی بۆ

خوێنەر بپێنکێت، ئەویش ئەوەیە ئەو هێرشە خوێناویانە نەیتوانیوە ئاینی ئیسلام گەمارۆ بدەن و لە ژیانی کۆمەڵگە دایبڕنێت، بەڵکو لەگەڵ زۆر هێنانیدا ئەم ئاینە زیاتر چەسپاوە و رەگی مێژوویی داکوتاوە، داوای نوسەر ئەوەیە موسڵمانان زیاتر پابەندی ئاینەکەیان بن، چونکە ململانێی کوفر و ئیمان ( حق - بَاطل ) ململانێیەکی نەبڕاوەیە و ئیمانیش سەرناکەوێت تاوەکو بۆی یەکلایی نەبیتەوە .

# بەشی سێیەم

## ململانێی دەسەلآت

### باسی یەکەم / ململانێی سەربازی

### باسی دووەم / ململانێی سیاسی

## باسی یەکەم
### ململانێ ی سەربازی

ئەو شەڕ و جەنگانەی کە لە نێوان موسڵمانان و جولەکە و گاوەرەکاندا روویدا، موسڵمانانی هاندا بۆ زیاتر پابەند بوون بە ئاینی یەکتا پەرستی و زیاتر باوەڕبوون بەو دۆزەی لە پێناویدا چوونەتە جەنگی دژانی خواوە و فەرمانی خوایان سەلماند کە دەفەرموویێت : (( إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ))

واتا : خوای گەورە لە ئیمانداران گیان وماڵیانی کڕیووە بەرامبەر بە بەهەشت، لە پێناو خوادا دەکوژن و دەکوژرێن و پەیمانێکە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا دوپات کراوەتەوە و پەیمانی لەسەر دراوە، جا ئێوەش مژدە بدەن و دڵخۆش بن بەو پەیمانەی بە خواتان داوە و ئەوەش سەرکەوتن و براەنەوەی گەورەیە .

ئەو حەوت جەنگە خاچپەرستیەی کە خاچپەرستان ئامادەیان کرد و دەستیان پێکرد، کرداریانە لە بیست و حەوتی ساڵی ١٠٩٥ روویدا، هەڵگیرساندنی ئەو جەنگانەش ئەو وتارە بوو کە ( ئەوبانی دووەم ) ( ١٠٨٨ – ١٠٩٩ ) لە نێو ئەو ئامادەبووانەدا وروژاندی کە لە ئەوفرینی کلیرمۆن لە باشووری فەرەنسا ئامادە بوون ، ئەو جەماوەرەش بوونە یەکێك لەو هێزە گەورانەی کە مێژووی ئەوروپای گۆڕی

ئەو مەسیحەی کە جولەکە چاوەڕێی دەکرد ئەو پێغەمبەرە نەبوو رووبەڕووی ئەو دەردەسەریە بێتەوە کە رووبەڕووی بوویەوە، بەڵکو پاڵەوانێکی نەتەوەیی بوو کە دەوڵەتی گەلی هەڵبژێردراوی خوا دابمەزرێنێت [1]

---

[1] علی عزت بیجوفیتش ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٧٣

که بۆیان دەرکەوت مەسیحی دەرکەوتە پێغەمبەرە و ئامانجی دەوڵەت و دەسەلاّتی سیاسی نیە، کەوتنە دوژمنایەتی کردنی و لای دەسەلاّتدارە بتپەرستەکانی رۆمانیش کەوتنە چاڵ بۆ کەندن و ئەو تۆمەتەیان خستە پاڵ کە دەسەلاّتی سیاسی دەوێت !

تەبشیریەتی مەسیحیەکان و بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکە، هۆکاری گەورەی گۆڕاندنی رەوتی مێژوو بوو بۆ ناشیرینکردنی ئاین و لاوازخستنی گەلان، پێشتر موسڵمانان لە ولاّتی خۆیاندا لە ژێر سایەی دەسەلاّتی ئیسلامیدا ئارام و سەربەخۆ بوون، ولاّتیشیان رازاوە بە زانست و شارستانیەتێکی گەورەیان هەبوو .

ئەوروپا لە سەدەی دە و یازدەی زایندا ناوچەیەکی تاریك بە کوشتن و ململانێ ی وێرانکەر بوو، پیاوە دەرەبەگەکان زۆر بوون و جوتیار و هەژارەکان بەکار دەبران لە بەرژەوەندی چینی بالاّ و خاوەن هێز، لە پێناو ئەوەشدا کڵیسا ئەوەی لە توانایدا بوو هەوڵی دەدا چوارچێوەی جەنگ لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی سەدەی یانزەی زایندا نەهێڵێت ، ئەوەش لە چوارچێوەی برەودان بە بزوتنەوەی ئاشتی خوا [٢]

جەنگە خاچپەرستیەکان لە ولاّتی موسڵماناندا لە پاڵ جەنگە سەربازییەکاندا سیاسیانەش بە گاورکردنی لە خۆ گرت، لە هەموو روویەکەوە گەمارۆی موسڵمانان درا بە کوشتن و بردنی سەروەتی موسڵمانان، ئەوەش نەك بۆ ئەوەی دەست لە ئیسلام بوونمان هەڵبگرین ببینە گاور، نەخێر، هەروەکو یەکێك لەو گەورە گاورانەی لە کۆنگرەی تەنصیریدا کە لە ( جبل زیتون ) بەسترا لە قودسدا ساڵی ١٣٤٣ ك - ١٩٢٧ ز ئەڵێ : ئاخۆ وا گومان دەبەن کە ئامانج و سیاسەتی تەنصیری بەرامبەر بە ئیسلام، دەرکردن و دورخستنەوەی موسڵمانانە لە ئیسلام تا

---

[٢] د . قاسم عبده قاسم : سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠ ، ٧٣

ببنه گاور ؟ نەخێر، گەر ئێوە وەها بیر بکەنەوە ئەوە نەزانن بەرامبەر بە تەنسیریەت و مەبەست و پلانەکانی [٣]

هەر ئەو مەبەست و هەنگاوانە ململانێی نێوان موسڵمانان و گاورەکان زۆر جوان روونده‌کاتەوە لە سەرەتای ئەو جەنگە خاچپەرستیانەی کە یەکێکە لە شێوەکانی تەنسیریەت وبە دوایدا هێزوداگیرکاری فیکری هات [١]

جولەکە و گاورەکان کە زۆر لە زووەوە بەیەك ئاشنان و دوژمنایەتی کۆنیان لە نێواندایە، دژ بە میراتگیری نوێیان لە پلاندا بەردەوام بوونە، رێك هاتن لەسەر ریشکە هێنانی ئەم ئوممەتە لە رێگەی بەکارهێنانی هێز و خوێن رێژی و بلاوکردنەوەی خراپەکاری و بەرەنگاربوونەوەی رابوونی ئیسلامی کە سەرچاوەی هێزەکەی لە ئیسلامدایە، چاوگێرانێکیش بەو رووداوانەی ئەمرۆ بەسەر موسڵماناندا دەهێنرێن زۆر بە روونی مەرام گەلێك دەبینین و بەکاولکردنی خاك و ماڵی موسڵمانان تاسەیان ناشکێنێت، دەشکرێت بروانرێت بە چی جۆرێ قەتڵ و عامی موسڵمان دەکرێت و دەیان تۆمەتیان دەخرێتە پاڵ و ئەو غەزووە فیکریەش کە هەیە موسڵمانانی لە یەکتر کردووە

برمشادۆر دەڵێ : کێ دەزانێ ؟ ئەکرێ ئەو رۆژە بێت و وڵاتی رۆژئاوا بکەونە ژێر هەڕەشەی موسڵمانان، لە کاتێکی گونجاودا بۆ جاری دووەم و داگیرکردنی جیهان لە ئاسمانەوە بەسەریا ببارێن، من ئاگاییەك نازانم، بەڵام ئەو نیشانانەی لەسەر ئەو ئەگەرەن، بەڵگە و نیشانە گەلێکی زۆرن، ئەو کاتەش گەر هات ئەوا هیچ ئەتۆم و موشەکێك ناتوانێ بەری پێ بگرێت [٢]

---

[٣] أ. د : علي بن ابراهيم الحمد النملة : التنصير مفهومه و اهدافه ، لا ٣٧

[١] أ. د . علي النملة ، هەمان سەرچاوە ، لا ٣٠

[٢] گۆڤاری : الرسالة الاسلامية ، ژمارەکانی ( ٢٥٧ – ٢٥٨ ) بەغدا .

موشەك و ئەتۆم ناتوانێ بەری پێ بگرێت، بۆچی ؟ موسڵمانانی ئەمڕۆ بەسەر چەندین دەوڵەتی بچووکدا پەرتەوازەن، سەرکردەکانیشیان بە هیچ جۆرێك ژێرباری بنەماکانی ئیسلام نین و لە ڕۆژئاواوە نزیکترن تاوەکو لە هەست و نەستی میللەتەکانیان، ئاخۆ ئەو هێزەی چی بێ کە هەڕەشەی ئەوان دەکات ؟ وەڵامیش لە قسەی ( فلیپ فواندس )دا دەردەکەوێت کە دەڵێت : ( پێویستە لە جیهاندا فەرەنسا ڕووبەڕووی ئیسلام ببێتەوە و سیاسەتێکی دوژمنکارانە بەرامبەر ئیسلام بە بەرنامە بکات، پێویستە بەلای کەمەوە ڕێگری بڵاوکردنەوەی بکات [٣]

بۆیە دەبینین لە مێژووی کەمێك ڕابردوودا فەرەنسا چ ڕۆڵێکی بینیوە لە داگیرکردنی خاکی موسڵمانان و کوشتارکردنیان و بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی و بیری بۆگەن و بە ئێستاشیەوە کە چاوی بە سەرپۆشی ئافرەتە موسڵمانەکانیشدا هەڵنایەت .

ئامانج لە ئاینی ئیسلامدا ، بانگەوازکردنی تێکڕای مرۆڤایەتییە بۆ یەکتاپەرستی خوا و ڕاپەڕاندنی دادگەرییەك شیاو بە مرۆڤ بێ، وشەی بالاش خوا و شەریعەتەکەی بێت .

بەلام ئەوان زۆر دڕندانە پەل دەهاوێژن و مەرامێکی سوتێنەریان هەیە، هەروەکو فۆکۆمایا دڕندانە دەڕوانێتە ئیسلام و نەتەوە موسڵمانەکان و پێی وایە دەبێ بەرەنگاری بکرێت و ئێستاش لە ڕۆژئاوادا بۆ پاراستنی هێزی ڕۆژئاوا پێویستە دوژمنێك هەبێت و تاوەکو بکرێتە میحوەرێك بۆ بەهێز بوون، ئەو دوژمنەش بۆ ئەوان لە ئیسلام باشتر نیە .

---

[٣] هەمان سەرچاوە .

ئەوان کە دەچنە هەر شوێنێکەوە کاولکاری بەرهەم دەهێنن، کەچی کە ئیسلام چوویە ئەندەلوسەوە گۆڕانێکاری گەلێکی بێ وێنە لە مێژوودا پەدیدا، خێرا ناوچەکە لە دواکەوتوویی و نەزانیەوە گۆڕا بۆ قوتابخانە و پەیمانگای زانستی و چەقی پەرەسەندنەکان و خەڵکیش لەژێر سایەی خیلافەتی ئیسلامیدا بە ئارامی و سەربەرزییەوە دەژیان ، بەبێ کۆیلە کردن و وێران کردن، مێژووش لەوەدا شایەتە

بەڵام ئەو هێزە دژە ژیانەی لای جولەکە و گاورەکاندایە گەر بچنە هەر شارێکەوە ویژدان و ئەخلاقی مرۆیی هەڵدەماڵێ، شار دەبێتە جێی ترس و تۆقین، وەکو ئەوەی لە عێراقدا بەرامبەر خەڵکانی مەدەنی ئەنجامی دەدەن، لە ئەتککردنی شکۆی مرۆڤەکان، دەستدرێژی کردنە سەر کچان و پاشان سوتاندنی ودەیان و سەدانی دیکە کە هەر خوا دەیزانێ، کە دەچنە هەر شوێنێك و وڵاتێکەوە بیانوویەکی لاواز وەردەگرن و تەنیا نیازیان کۆیلەکردنی گەلانە

ئەو رووداوانەی ئەوان بەسەر جیهانیان هێنا تەنیا لای ئاژەڵە درندەکان ئاساییە، لە کوێدا ئاینی موسا و عیسا ( سەلامی خوایان لەسەربێ ) پێی ڕەزامەند دەبن ؟ !

ئەوان گەر ئاینەکانیان لا پیرۆزە،بۆچی بانگەوازی بۆ ناکەن و پەنا دەبەنە بەر فرۆفێڵ و ئامرازی پیس و خراپ ؟

جولەکەی گەلی هەڵبژاردەی خوا ! گاوری لەوی دروست بوو، خۆیان دادەنێن بەوەی نەوەی ئافرەتی ئازادن ( واتا نەوەی سارا )، لە ئینجیلدا هاتووە کە ئیبراهیم دوو کوڕی هەبوو کوڕێکیان لە جاریەیە و ئەویتریان لە ئافرەتی ئازاد ( سەربەست )، وەهایان نوسیوە کە خوا فەرموویەتی : جاریە و کوڕەکەی دەربکە، چونکە کوڕی جاریە لەگەڵ کوڕی ئازاد دا میرات نابات، کەواتە برایان ئێمە نەوەی ژنە جاریەکە نین، بەڵکو نەوەی ژنە سەربەستەکەین [1]

---

[1] غلاطية ٤ ، ٥ الانجيل : كتاب الحياة ، لا ٥٦٦

ئەوەیە ڕوانینی ئەوان بۆ کۆیلە، هەروەکو لەسەردەمی ئەبراهام لنکۆڵن لە ئەمریکادا جیابوونەوە ڕوویدا و سەوداگێری کردن بە کۆیلەکانەوە کرا، تازە بە تازە خەڵکانێکی پڕ کراو بە مەبەست ڕەخنە دەگرن لە ئیسلام کە کۆیلایەتی کردووە، لەکاتێکدا ئیسلام داوای شکۆی مرۆڤەکان دەکات و بۆ پاکبوونەوە لە هەندێ تاوان داوای ئازادکردنی کۆیلە دەکات، ئەوەی ئەوان دەیڵێن پێچەوانەیە، چونکە ئیسلام سەلماندوویەتی کە نەوەی ژنی جاریەش چۆن لە ئیسماعیلدا پێغەمبەری هەبووە، وا ئێستاش کۆتا پێغەمبەر کە دوا پەیامی بۆ هاتبێ، دەگەڕێتەوە بۆ وەچەی ئیسماعیل کە کوڕی جاریەیە، ئەوەی چاوی بەوەدا هەڵنایەت هەر لە دەرەبەگ و داپڵۆسێنەر و کۆتکەری ئازادیەکان دەوەشێتەوە

گەلی هەڵبژێردراوی خوا ! نەوەی ژنی سەربەست دەبێ هەر کۆیلەی هەبێ ! ، بۆ پەیدا کردنی ئەو کۆیلایەتیە پێویستە جەنگ و هەڵکوتانە سەر وڵاتان و پەرتەوازە کردنیان بێتەدی و پەشێویان بخرێتە نێوانەوە، تاوەکو لە کێشەدا ڕۆبچن و ئەوانیش خێر و خۆشیان لێ زەوت بکەن !

## باسی دووەم
## ململانێی سیاسی

پیلانە سیاسیەکانیش رۆژ بە رۆژ لە فراوانبووندان، موسڵمانان و مرۆڤایەتی لە چەرمەسەریدان، جەنگ و کوشتار و بێ سەروبەری لە برەودایە و برسی کردنیش سیاسەتێکی دیکەیە، سیاسەتی دەسەڵاتەکان ناجێگیر و داپڵۆسێنەرییە، لە پێشتریشدا کار لەسەر هەڵگەڕانەوەی دەسەڵات دەکرا، لەوەی لە لابردنی سوڵتان عبدالحمیدەوە ئەو دەروازەیە شکێنرا و جیهانی ئیسلامی بوویە جیٚ ی تاقیکردنەوەی سیاسەتەکان، کە لەلایەن کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی جیٚ بەجێکاری پیلانی جولەکەوە ئەنجام درا بۆ لێدانی ئیسلام، ئەو پرۆسەیەش لەسەر شارەزایی لە مێژینەی خاچپەرستی سەهیۆنیەتەوە کرا تاوەکو ئەزموونەکەی ئەتاتورك ببێتە ئەزموونێك وخاچپەرستێتی سەهیۆنیش شانازی گەورەی پێوە بکەن و بە بەرهەمێکی گەورەی دەزانن لەو ئامانجەی پلانیان بۆ کێشا بوو

ئامانجی ئەوان قەڵاچۆکردنی ئیسلام و سەربڕینی موسڵمانان بووە، ئەو ئەزموونەی ئەتاتورك لای ئەوان سەرکەوتوو بوو، ئەمریکاش توانی زۆر سەرکەوتووانە و بیٚ دارایی کردن ئەو ئەزموونە دووبارە بکاتەوە، ولیەم کارە لە کتێبی ( احجار علی رقعة الشطرنج ) دا دەڵیٚ : جولەکە جەنگی جیهانی یەکەمی هەڵگیرساند بۆ مەبەستی نەهێشتنی دەوڵەتی عوسمانی تاوەکو رەخساندنێك بێت بۆ دروست بوونی دەوڵەتی جولەکە، جەنگی جیهانی دووەمیش بۆ بەکردار بوونی دەوڵەتی جولەکە بوو [1]

---

[1] محمد قطب : الصحوة الاسلامية ، ل ٣٢ ، ٣٥

بەرەی ڕۆژئاوی مەسیحی و جولەکە باش دەزانن کە زەوی موسڵمانان دەوڵەمەندە بە ژیاریەوە، بۆیە چاویان تێ بڕیووە، هەروەکو ( پۆل ئەشمید ) ی گەڕیدەی ئەڵمانی لە کتێبی ( الاسلام قوة الغد ) ئیسلام هێزی سبەی – ئەڵێ : تایبەتمەندییەکانی هێز لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لە سێ شت پێك هاتووە :

١. لە هێزی ئیسلام وەکو ئاین و باوەڕ پێ بوونی، لە نمونە بەرزەکان و برایەتی کردنی لە نێوان ڕەگەز و ڕەنگ و ڕوناکبیریە جیاوازەکان
٢. دەوڵەمەندی سەرچاوە سروشتیەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی کە بۆ ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بە سنوری مەراکیش ڕۆژئاوا و بۆ ئۆقیانوسی ئارام لە سنوری ئەندەلوسیا ڕۆژهەڵات دەکشێ
٣. لە پیتی و تۆکمەیی ڕەچەڵەکی مرۆیی موسڵمانان، ئەمەش وەهای کردووە هەمیشە لە زیاتر بووندا بن، پاشان ئەڵێ : ئەگەر ئەم هێزە کۆبێتەوە، برایەتی موسڵمانان بە یەکبوونی بیر و باوەڕ و سەروەتی سروشتیان و ڕێژەیان، ئەو کات مەترسی ئیسلامی دەبێتە ورياکەرەوە بۆ لە نێو بردنی دەسەڵاتی جیهانێتی ئەورووپا لە ناوچەکەدا کە چەقی هەموو جیهانە [٢]

گەر بە چاوی وردبوونەوە وە بڕوانینە ڕووداوەکانی ئەمڕۆی موسڵمانان و ئەو سێ هێزە، لە وێرانکردنی زەوی موسڵمانانو دزینی کانزاکانیان و دروستکردنی دوژمنایەتی لە جیاتی برایەتیکردن، ئەو کات تێدەگەین کە ڕووداوەکان بۆ سڕینەوەی ئەو هێزانەی ئیسلامە .

---

[٢] د . یوسف القرضاوي : المبشرات بانتصار الاسلام ، لا ٨٤ .

سیاسەتی تەبشیریەت و سەهیۆنیەت لەسەر ئەو ویرانەیە دامەزراوە کە زوێمەر لە کتێبی ( الاغاره علی العالم الاسلامی ) دا کێشاویەتی و ئەڵێ : دوو تایبەتمەندیمان هەیە، کە رووخاندن و بونیاتنانە، رووخاندن مەبەست پێ ی دارنینی موسڵمانە لە ئاینەکە، گەر هەنگاو پێ هەڵگرتنیشی بێ بۆ بێ باوەڕی .

تایبەتمەندی بونیاتنانیش : پەروەردەکردنی موسڵمانە بە روناکبیری رۆژئاوا، تاوەکو شان بە شانی ژیاری رۆژئاوا رووبەڕووی نەتەوەکەی خۆی بێتەوە [1]

ئەمڕۆش بەڵگەیە لەسەر سود وەرگرتنی ئەوان لە ئاین و فیقە و مێژوو و فیکر و ژیارمان، وەهایان بەسەر هێناوین کە لە هەمبانەی خۆماندا چارەسەی کێشەی سیاسیمان نیە ! ئەوان گەرچی بەهایەکی ئەخلاقیان لەسیاسەتدا نیە، کەچی دڵسۆزی خاك و بۆچوونی خۆیانن و لە دەستدانی متمانەش لای ئێمە خۆشەویستی گەل و نیشتمانی بۆلاواز کردوین .

---

(1) said.net

## بەشی چوارەم

## کێشەی فەلەستین و دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل :

فەلەستین ئەو خاکەیە کە لە مێژوودا بە زەوی کەنعان ناوبراوە، خەڵکەکەشی بە کەنعانیەکان ناوبراون، زەوی گەلی کەنعان بووە، ئیبراهیم ( علیه السلام ) وڵاتی بابل ( عێراقی ئەمڕۆ ) بەجێ دەهێڵێ لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی سەخت کە لە لایەن فەرمانڕەوای بێ باوەڕەوە بۆی سازێنرابوو، لە رزگاربوون لە دەستی فەرمانڕەوا و رێگەگرتنەبەر جارێکیتر دەکەوێتە تاقیکردنەوەیەکی دیکەوە، لەوەشدا خوای گەورە پەنای دەدات و رزگاری دەکات و ئینجا ڕوودەکاتە خاکی کەنعان .

ئەو نەوەی ئیبراهیم (علیه السلام) کە لە خاکی کەنعان دەمێنێتەوە ئیسحاقە (سەلامی خوای لەسەر بێ)، هەروەکو چۆن ئیسماعیلی کوڕیشی لە زەوی حیجازدا جێگیر دەبێت و وەکو هەر دانیشتوییەکی دی تێکەڵ بە دانیشتوانەکەی دەبێت و لە رێگەی ژن و ژنخوازییەوە زۆر دەبنەوە، نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت ئیسحاق (سەلامی خوای لەسەر بێ) یەعقوب کوڕی دەبێ لەنەوەی یەعقوب یوسف دەکەوێتە میسرەوە پاشان هەموو نەوەکانی ئیسحاقی پێغەمبەر ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) دەچنە میسرەوەو لەوێ دەگیرسێنەوە و خێڵی بەنو ئیسرائیل دەبنە هاولاتی میسری، ئەمەش ئاشکراکەری ئەوەیە کە لە تەوراتدا هاتووە بەوەی خوا بە ئیبراهیمی وتووە کە ئەم زەویە بە نەوەی تۆ دەبەخشم و ژنەکەشت کە ناوی سارایە بکەرە سارا و لەویش نەوەیەکی هەمیشەییت پێ دەدەم .

ئایە گەر موژدەیەکی ئیلاهی لەسەر بەخشینی ئەو خاکە هەبێ بە بەنو ئیسرائیل، بۆچی یەعقوبی پێغەمبەر:

( سەلامی خوای لەسەر بێ ) بەرەو میسر فەلەستینی بەجێ دەهێڵێ و بۆ چەند وەچەیەك ئەو خێڵە لەوێ دەمێننەوە ؟ گەر سەردەمی کۆیلەکاری

نەهاتبایەت و موسا ( سەلامی خوای لەسەر بێ ) دەرنەکەوتبایە، ئەوا هەر نە دەگەڕانەوە و میسریان بەجێ نەدەهێشت . ئەوان لە نەوەی بهاد و نەشیر و دان و نفتالی کە بینیان فیرعەون و سوپاکەی لە دواوەیانن، وتیان با خۆ بەدەستەوە بدەین گەر هێشتیان بژین ئەوا خزمەتکاریان بۆ دەکەین، بەڵام نەوەی یەهوزا و یوسف و بنیامین وتیان : نەخێر بەم چەکانەمان کە پێمانە جەنگیان پێ دەکەین و خوامان لەگەڵ دەبێ [1]

پێشتر کە رێیان کەوتبووە کەنعان و پاشان بۆ چەند نەوەیک لێ ی دابڕان ، ئینجا لەتەك موساشدا نەچوونە ئەو خاکەوە و لە سەرکەشی و ناڵەبار بوونی زۆرێکیان چل ساڵ بە سەرگەردانی دەسوڕانەوە ، لە بەرامبەر جالوت و سوپاکەشیدا دەستەوەستان مانەوە و ئامادەیی جەنگ و بەرگری نەبوون ، نە لە خۆیان و نە لە بیروباوەڕیان .

سەردەمی دەسەڵاتی طالوت و داود و سولەیمان ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) سەردەمی دەسەڵاتی یەهودیەت بوو، یارمەتی خوایی لەتەکدا بوو، پارێزگاریکردن بوو لە بیر و باوەڕی یەکتاپەرستی و قودسیش

( اورشلیم ) پیرۆزی خۆی هەبوو و هەیکەلی سولەیمانیش جێ ی پەرستن و بەندایەتی کردنی خوا بوو

ئەم هەیکەلە لە پێش ئیسلامدا دوو جار ڕ، وخێنراوە

شوێنی ئەم هەیکەلە لە پێشتردا ( واتا لە پێش سولەیمان ) دوای مردنی موسا و هارونی برای

( سەلامی خوایان لەسەر بێ )، یوشەع بن نونی پێغەمبەر فەتحی ئەو شارەی کرد و گومەزی موسای لەسەر

( الصخرە ) ە ی ئێستا دانا

---

[1] التوراة المنحول ، کتابات ما بین العهدین II ، لاپەڕە ٢٠٢

هەیکەل دوو جار دەڕوخێنرێت، جاری یەکەم لە سەردەمی بابلییەکاندا و لە ئەنجامدا دەبنە ژێر دەستەی بابلییەکان و دوور لە فەلەستین و قودسی پیرۆز دەژین، پاشان جولەکەکان دەبنە یارمەتیدەری دەسەڵاتداری فارس و، دەگەڕێنەوە فەلەستین دوای نەمانی دەسەڵاتی فارس لە فەلەستین و داگیرکردنی لە ساڵی ٦٣ پ . ز لە لایەن ڕۆمان و دەسەڵاتداربوونی هیرۆدس ڕێگە درا هەیکەل دروست بکرێتەوە، بەڵام دوای بە درۆزانینی پێغەمبەرێتی عیسا و خراپەکاریان پادشایەکی ڕۆمانی بەناوی ئیمپراتۆریەتی طیطس ساڵی ٧٠ پ . ز شاری قودسی دەسوتێنێ و پەرستگاکەی دەڕوخێنێت، لەدوای روخانەکەی بەختەنەسەر بە دووەم ڕوخاند دادەنرێت، دوای ئەوەش ئادەریانوس دێ و شوێنەواری شاری پیرۆز ناهێڵێ و هەیکەلیش لە ساڵی ١٣٥ ز لە نێو دەبات ولەجێگەکەیدا پەرستگایەك دادەنێت بەناوی (جۆبێتیر) واتا : خوای خواوەندەکان .

لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانە و نەمانی دەسەڵاتیان و پاشان دەسەڵاتداربوونی مەسیحیەکان لە ناوچەکەدا جولەکە زیاتر پەرتەوازەی وڵاتان دەبن و بە کاروباری بازرگانییەوە سەرقاڵ دەبن و لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا زیاتر دوور دەگرن . بەڵگەیەکی مێژوویی لەبارەی شای ئۆغسیورگەوە هەیە کە دەڵێ ساڵی ١٣٨٣ دوای ئەوەی برجوازەکانی شار هەموو جولەکەی شاریان سەربڕی، هەموو سەروەتەکانیان دەست بەسەرداگرت و قەرزدارە جولەکانیان رزگار کرد، ئەوەش جەماوەر پێ ی هەڵسا ، سەرەڕای ویستی ئەنجوومەنی شار [1]

---

[1] ابراهام ليزن : المفهوم المادي للمسالة اليهوديه ، ل ١١٣

هەروەها جولەکە لە یاسای پۆڵۆنیادا کۆیلەی خەزێنەی پادشایەتی بوونە [٢] ، دانەری کتێبی ( رحلة ملازم موسكو بی من تریستا الی القسطنطينية ) لە ساڵی ١٨١٠ ئەڵێ : پێویستە پۆڵۆنیا بەبێ هیچ لایەنگیریەك بە پادشایەتی جولەکەی ناو ببەین، ئەوان لە شارە گەورە و بچووکەکاندا زۆرینە پێك دەهێنن [٣]

بڵاوبوونەوەی جولەکە لە وڵاتاندا سەرەنجام وەکو میسری لێکەوتۆتەوە، سیفەتی خۆبەگەورەزانین و بە چاوی ئاژەڵ روانینەخەڵکی و برسی کردنیان، سەرەنجام لە دژیاندا شۆڕش بەرپا بووە و بە کۆیلە کردنیان هاتۆتە دی، ئەوەتا گەر خەونی باڵادەستی و بێ بەشکردنی خەڵکی نەبێ لە سەروەتی ژیان، بۆچی لە پۆڵۆنیادا لە زۆرینەوە دەبنە کۆیلەی خەزێنەی پادشا، ئاخۆ بانگەوازی یەکتاپەرستی وەهای بەسەر هێنان کە نەوەی خوان ! یان چاوچنۆکی و خراپ روانیین و بیرکردنەوە ! ؟

جولەکە ئەوەندە لە ئەوروپادا هەبووە، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بوونی نەبووە، ئەبراهام لیۆن دەڵێ کە ساڵی ١١٨٩ لە لەندەن و لنکلن و ستمفۆرد بەهۆی بێ بەزەییانەی جولەکە لە داراییدا قەسابخانەی جولەکە کرا و لە یەکێك لە کۆشکەکاندا گەمارۆ دران و جولەکەکان ناچار بە خۆکوشتن بوون و ساڵی ١٢٦٢ یش لە لەندەن نزیکەی ٥٥٠ جولەکە کوژرا [٤]

بەڵام بە ڕوانین بۆ خاکی موسڵمان نشین و سەرەڕای دوژمنایەتی و ناپاکیان بەرامبەر موسڵمان، خاوەن سەروەتی خۆیان بوونە و سەربەرزانە ژیانی خۆیانیان درێژە پێداوە، ئەوان لە ژێر دەسەڵاتی جیهانی مەسیحیەتدا پاکتاوی حیسابی کۆن کراون و قێزەونانە بۆیان ڕوێنراوە و تۆڵەی لە خاچدانی عیسایان ! لێ وەرگیراوە و ئەو کاتەش کە فەلەستین لەژێر

---

[٢] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە .

[٣] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە .

[٤] ئەبراهام لیۆن ، هەمان سەرچاوە . ، ل ٨٩

دەسەڵاتی مەسیحیەتدا بووە نزیکبونەوەیان لە هەیکەل و قودس قەدەغە و سنوری سوور بووە . لە ساڵی ( ٦١٠ ز ) شاری قودس دەکەوێتە دەست موسڵمانان و پیرۆزی ئاینی بۆ دەگەڕێتەوە، قودس قودسیەتی ئاینی هەیە، میراتی ئاینی خوایە، وەکو وتمان هەیکەلی قودس تەنیا گرنگییەکی مامناوەندی هەبووە بۆ جولەکە و تەنیا بۆ حەجکردن ڕوویان لێکردووە، لە ئەوروپاشدا تاوەکو ڕوودانی شۆڕشی فرەنسی لە داپڵۆساندنداندان بوون و شۆڕشی فرەنسی داپڵۆسینی ئاینی دژ بە جولەکەی نەهێشت [٥]

لە ( سفر عەزرای چوارەمدا ) هاتووە کە چووەتە لای خوا و وتوویەتی : ئەی پەروەردگارا تۆ ڕاتگەیاندووە کە لە پێناو ئێمەدا جیهانت دروست کردووە، نەتەوەکانی تریشت لە ئادەم دروست کردووە وتووتە کە هیچ نین، نەتەوە گەلێکن هاوشێوەی بوکی یارین، ئەو نەتەوانەی کە هیچ نین وا بەسەرماندا زاڵ بوونە و دەمانخۆن، ئێمەش گەلی تۆین، تاقانەتین و غیرەتت بۆمان دەجولێ، کەچی دەماندەیتە دەستی نەتەوەکانی تر، ئاخۆ گەر جیهانت لەبەر ئێمە دروست کردووە بۆچی جیهان نابێتە میراتی ئێمە و تاوەکو کەی کاروباری وەها دەبێ ؟ خوای گەورەش موژدەی بە هاتنی عیسا داوە کە ئەو دەسەڵاتی کۆتایی جیهانی هەیە [١]

ئەمەیە خەونی ئەوان، خەڵکی جیاوازیان نیە، ئاسیایی بن یان ئەوروپی و ... هتد ، تەنیا بۆ خزمەتکردنی ئەوان دروست کراون، لە نامە و پەیامی خۆیاندا ڕقێکی توندیان بەرامبەر میللەتان حەشارداوە و تۆڕێکی شاراوەی ترسناکیان پێك هێناوە لە ڕووی دارایی و ئاژاوە گێڕییەوە، ئەوەش هەر لە کۆنەوە سروشتیان لەسەر وەرگرتووە و ئەزموونی هەزاران ساڵیانە .

بە نالەباری ژیانیان لە نێو میللەتانی دیکە و کیشوەرانی دیکەدا، لە پاڵ کاری ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی کە رویان دەکردە رۆژهەڵات و لە کلتور و ئاین و مێژووی رۆژهەڵاتییەکان لێکۆڵینەوەیان دەکرد،

بەتایبەت لەسەر ئیسلام و موسڵمان، جولەکەش لەوەدا سودێکی گەورەی دەسکەوت کرد، ئەوەش بە مەبەستی چاوخشاندنەوە بە ڕابردوویان

---

[٥] هەمان سەرچاوە ، ل ٢٢

[١] بڕوانە : التوراة المنحول II ، كتابات ما بين العهدين .

و رزگاربوون لەو نامۆییەی کەلە نێو نەتەوەکاندا رووبەڕووی بوونەوە و بە ئاسانی لەو دابڕانە ڕزگاریان نەدەبوو، جولەکە رۆژهەڵاتناسەکانیش لە رووی مێژوو ، کلتور ، ڕوناکبیری ، کەسێتی، بارودۆخی گشتی و کاروبارەکانی دیکەی ئیسلام ونەتەوکانی ، دەستیان بە لێکۆڵینەوە کرد ، لەوانە سۆلۆمۆن مۆنك ( ١٨٠٣ – ١٨٦٧ ) فرەنسی بوو، ئجنتس جولدتیهر، یەعقوب بارت ( ١٨٥١ – ١٩١٤ ) ، ریتشارد گوتهیل ( ١٨٦٢ – ١٩٣٦ ) کە ئینگلیزی بووە، ئەرمینۆس خامبری هەنگاری ( ١٨٣٢ – ١٩١٣ ) ، جۆزیف هۆرۆفیتشی ئەڵمانی،ماکس مایرهۆڤ ئەڵمانی،دایڤید بانت – ئەڵمانی ـ پاوڵ کراوس – براغ ( ١٩٠٤ – ١٩٤٤ )، هەموو ئەمانە وەدیان ڕۆژهەڵاتناسی دیکە کەوتنە چالاکی بۆ بوارکردنەوە لە کۆکردنەوەی جولەکە لە ڕۆژهەڵاتدا و داگیرکردنی زەوی ئیسلام [٢]

جولەکە پێچەوانەی ژیانی لە نێو نەتەوە و ئاینەکانی دیکەدا زۆر سودیان لە ئازاری ئیسلام وەرگرتووە، سندوقی پشکنینی فەلەستین و کلۆد کۆندری ئەو سندوقە دەڵێ : ژمارەی جولەکە لە شاری قودس ساڵی ١٨٢٧ چەند سەد کەسێك تێپەڕی نەکردووە، بەڵام ساڵی ١٨٩٢ ژمارەیان زۆرتر بۆتەوەو لە گەلانی ئیسلامی کۆڵیونەتەوە و سودیان لە هەموو ئەو خاڵە لاوازانە وەرگرتووە کە لە تاك و کۆمەڵگەی موسڵماندا بوونی هەبووە، ئەوەش وەنەبێ یارمەتی ڕۆژئاوای لە پشت نەبووبێ، نەخێر، وەکو ئیدوار سەعید ئەڵێ : لەبەر ئەوەی ئیسلام سەرچاوەکەی بۆ ڕۆژهەڵاتە، ئەوە لە نێو بازنەی پڕ لە دوژمنکاری و ترسەوە بۆی دەڕوانرێ، گومانیش نیە لەوەی هۆکاری ئاینی و دەرونی و سیاسی زۆرن بۆ ئەو رق و ترسە، بەڵام گشت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوروپا هەستی وایە بەوەی ئیسلام نەك ململانێکارێکی بەهێزە، بەڵکو تەحەدا کارێکی تازەی سەردەمی مەسیحیەتیشە [٣]

---

[٢] ابراهیم عبدالکریم : الاستشراق و ابحاث الصراع لدی اسرائیل ، دار الجیل – الطبعة الأولی ١٩٩٣ ، لا ٤٠ .

[٣] ادوارد سعید : تغطیة الاسلام ، ترجمة : د . محمد عناني ، رؤیة للنشر ، الطبعة الاولی ٢٠٠٥ م ، لا ٧١ .

## سەهیۆنیەت و بزاوتی کۆکردنەوەی جولەکە :

سەهیۆنیەت: بزوتنەوەیەکی جولەکەیی ئاینی سیاسیە، ناوەکەی لە ( صهیۆن ) ەوە هاتووە کە چیایەکە و کەوتۆتە باشوری ڕۆژئاوای قودسی کۆنەوە و ئامانجی گەڕاندنەوەی ئیسرائیلە بە دروستکردنی دەوڵەتێکی جولەکە لە فەلەستین، گەر دەستگیرا بەسەر قودسدا ئەو کات هەیکەلی سولەیمان لە شوێنی مزگەوتی ئەقصا دادەنرێت، لەم دەوڵەتەدا لە ڕەچەڵەکی داود پادشایەکی جولەکە دێتەوە و جیهان دەسەڵات دەکات، ئەم بزوتنەوەی سەهیۆنیە لە نێوان ئاین و سیاسەتدا تێکەڵی کردووە و ئاینی وەکو بنەمایەك وەرگرتووە کە بانگەوازی سیاسی لەسەر وەستاوەتەوە

خوای گەورە لە قورئاندا ئامۆژگاری موسڵمانان دەکات بە یەکڕیزی، وەکو دەفەرموێت ((وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ )) واتا: دەست بگرن بە ئاینی خواوە و پەرتەوازە مەبن، چونکە لە پەرتەوازەییدا هێز و شکۆتان نامێنێ  موسڵمانان لە وەها دۆخێکدا زیاتر لە یەك دووردەکەوتنەوە، کەچی جولەکە لە ژێر پەردەی ئایندا خاوەن ڕەگەزە جیاوازەکانی ئاینزاکانی خۆی لە سەهیۆنیەت و ماسۆنیەتدا کۆکردەوە و لە ژێر تاجی پادشایەتی نەوەی داود دا یەکەمین کۆنگرەی لەشاری بالی سویسرا لەساڵی ۱۸۹۷ بەسەرۆکایەتی هیرتزل بەست و و بڕیاری کۆیلایەتیکردنی جیهانیان ڕاگەیاند و تاجە گوڵینەی ئەوان و نەوەکانیان پرۆتۆکۆلات بوو،کە لە فەرهەنگی دڕندەدا بیری لێ دەکرێتەوە

دەبێ ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە جولەکە پێشتر بیری لە هەرێمی بیروبیجانی ڕوسیا بووە و هەرێمێکی تەواو جولەکە بووە [1] ، ئەی زەوی فەلەستینی بۆچی ؟ !

---

[1] بڕوانە : اسرائيل الاول ( اقليم بيروبيجان ) : د . اسعد السحمراني ، دار النفائس ، ١٤٢٥ ه – ٢٠٠٤ م .

مەسیحیەت بە بیرو کلتورەوە هەمیشە جولەکەی لا قێزەون بووە، دوژمنایەتییەکی ڕیشەیی هەیە لە نێوانیاندا، تا ئەم سەردەمە لە خوێنی عیسا ! بوران و بنەمای یەك سەرچاوەیی دوو ئاینەکەی لە پێش چاو گرت ! ئەو ناپاکییەی جولەکە کە لە قورئاندا تۆمارکراوە واقیعیانە لە ئەوروپادا پەیڕەویان کرد، وەکو ئەوەی هیتلەر دەڵێ : من لە جولەکەدا مەخلوقێکی سەیر دەبینم پێشتریش باسم کرد کەسنیك ( Seneque ) جولەکەی بە ڕەگەزی تاوانبار ناساندووە .

هیتلەر کە قۆرغکاری جولەکە دەبینێ و بێدەربەستیانی بۆ ئاشکرا دەبێ لە پاڵ یارمەتیدانی بەرەی دژ و خۆیشی ( هیتلەر ) پاشخانێکی پرۆتستانتی هەیە و وەکو مارتن لۆسەر دوژمنایەتی بۆ جولەکە هەبووە، ئەو کوشتارەی بە سەرداهێنان و لە هەموو ئەوروپادا گوشاریان خرایە سەر و هەرێمی بیروبیجانیش هەڵوەشایەوە و بۆ دورخستنەوەی تەشقەڵەیان کەوتنە هاوکاریکردنی دژ بە گەلانی ئیسلامی و بە تایبەت لە فەلەستیندا

دیارە جولەکە ( بەنو ئیسرائیل ) پێش سەردەمی داگیرکاری ئاشوری و بابلییەکان لە فەلەستین دەسەڵاتیان هەبووە، پاشان پەرتەوازەیی وڵاتان و سەرەتایەکی کۆمەڵایەتی و لەوێشەوە بۆ دروست بوونی رق و تورەیی دژ بە گەلان، پاشان لەو شوێنە گەلانی دیکە لە ڕووی سیاسی و دەسەڵات و نیشتەجێ بوونە و دەبنە خاوەنی ، لە دواتریشدا ئیسلام بۆ زیاتر لە هەزار و سێ سەد و شتێ ساڵ و شتێك دەبێتە خاوەنی، واقیعیانەش ئەم زەوییەی ئێمە لەسەری دەژین بە درێژایی مێژوو دەیان میللەت تیایدا ژیاون و کۆچییان کردووە و لە شوێنێکی دیکەدا گیرساونەتەوە .

زەوی عێراق پێشتر ئاشوری و بابلی و ئەوانی دیکەی لەسەر ژیاوە، شارستانیەتی عێراق بەشێکی دیاری جێ دەستی ئەوانە، ئاخۆ دەکرێت لە ئێستادا ئەم وڵاتەمان لێ داگیربکەن، بەو بیانووەی بۆ ماوەیەکی زۆر خاوەنی

ئەم خاکە بوونە ؟ ئەوان زۆر لە جولەکە بە دەسەلاتتر بوونە و کردارانە جولەکە بووەتە کۆیلەیان و دەبێ یەکێك لە هۆکارەکانیش بۆ جێ بەجێ نەکردنی ئەو بەڵێنەی کە بریتانیا بە ئاشورییەکانی دابوو لەوەی دوای ڕوخانی خیلافەتی عوسمانی و سەرەتای دەسەلاتی عەلمانی تورکیا ڕووبەڕووی ستەمکاری بوونەوە و هێنرانە خاکی کوردستانی عێراقەوە بەمەبەستی دروستکردنی دەسەلات بۆیان [1] تۆڵەی ڕابردویان لێکردنەوە، ئەگینا هۆکار دەبێ چی بێ ؟ تەنیا ئەوەیە سریانی و ئاشورییەکان خەیالاتی وەکو جولەکەیان نیە، وەکو ئەوەی لە تەلموددا هاتووە کە ئەبو خوز نەسر ( بەختە نەسر ) کاتێك ولاتی ئیسرائیلی وێران کرد و هەیکەلی پیرۆزی ڕوخاند و خشلەکانی برد، خوا لە گریان و هاوار دەستی هەڵنەگرت، چونکە هەڵەیەکی گەورەی کرد ، ئەو هەڵەیەش ویژدانی خوای ناڕەحەت کرد و هاواری دەکرد، لە نێو چوون بۆ من، چونکە من ماڵەکەم واز لێ هێنا بدزرێ و هەیکەل بسوتێنرێ و منالەکانم سەرگەردان بکرێت .

ئەو خەیالە منالێکیش عەقلی پێ دەشکێت، دەبێ ئەو خودایە چۆن بێ کە لە گریان و هاتوهاوار زیاتر هیچی پێ نەکرێت، گریان کەی لە سیفەتی خوایە، بەلام ئەوان ڕاهاتوون کە سیفەتی خراپەکان بدەنە پاڵ خوا لە گریان و بەخیلی و گۆجی و ... هتد .

جولەکە و ڕۆژئاوا هەمیشە بیانوویان بۆ شتەکان هەیە، چ یاسایەك ڕێگە دەدات میللەتێك بۆ زیاتر لە هەزار ساڵە لە خاکێکدا دەژی دەربەدەر بکرێت ؟ چ ویژدان و یاسایەك ڕێگەی دا هیندییە سورەکانی کیشوەری ئەمریکا و هاولاتی ڕەسەنی ئەو کیشوەرە پاکتاوبکرێن، لە جیاتی ئەوەی بانگەواز بکرێن بۆ ئەو ئاینەی کە هەیانە؟ بەلام ئەوەش دیارە قسەیەکی بە دەق کراوی حیساب نەکراوی بۆ ئەخلاق، هەردەبێ وەها کارەساتێك لە مێژوودا تۆمار بکات .

---

[1] بۆ راستی ئەم باسە بڕوانە : العراق : دراسة في علاقاته الخارجية و تطوراته الداخلية ١٩١٥ – ١٩٧٥ ، اديث واني ، ايف بيلروز . ترجمة : عبدالمجيد حسيب القيسي .

داگیرکردنی فەلەستین لە دوای روخاندنی خیلافەتی عوسمانییەوە بوو، هەرەسپێهێنانیشی هەر بۆ دروستبوونی دەوڵەتی جولەکە بوو لە خاکی فەلەستیندا و عەرەبیش کە خۆی بە خاوەنی ئەو کێشەیە دەزانی، لە جیاتی خەباتی ئـاینی دروشمـی پێـچەوانەی بـە ئیـسلام هـەڵگرتووە و لـە بـەرەنگاریکردنی داگیرکـاردا زوو دۆڕا، دەسـەڵاتی عـەرەبی لـە جیـاتی دەستخۆشی کردن لە ڕەوتی خەبات کەچی مەلیك فاروقی میسر بە هاوکاری سەفیرەکانی بریتانیا و ئەمریکا و فرەنسا کەوتنە لێدانی بزوتنەوەی برایانی موسڵمان و سـەربازگەکانیان نەهێـشت و چـەکیان کـردن، لـە کاتێکدا ئـەو بزوتنەوەیە ڕۆڵێکی دیاری هـەبوو لـە بـەرگریکردنی ئیسلامییانە لە خـاکی فەلەستین و گەلەکەیدا

جولەکـە دەزانـێ بـوونی ناسـنامەی ئیـسلامییانە بـۆ خـەباتی فەلەسـتین دۆزەکەیان بۆ سەخت دەکات، هـەروەکو ڕۆژنامـەی (( یـدعوت ئـەهرنوت )) ی جولەکە ١١ / ٣ / ١٩٨٧ دا دەڵێ : پێویستە ڕاگەیەندنەکانمان راستەقینەیەك لە بیر نەکـەن کـە بەشـێکە لـە ستراتیژییەتی ئیسرائیل لـە جـەنگی لەگـەڵ عەرەبدا، ئەوەش ئەو ڕاستەقینەیە کە ئێمە بۆ سی ساڵە لە جەنگمان لەگـەڵ عەرەبدا بە هاوکاری هاوڕێکانمان لە دوورخستنەوەی ئیسلام لەو کێشەیە سەرکەوتین، پێویستە بۆ هەمیشە ئیسلام لەو جەنگە بە دوور بێت، پێویستە بۆ ساتێکیش بێ ئاگا نەبین لە بەرامبەر جێ بەجێکردنی پیلانەکانمان لە بەردەوام بوونی ڕێگریکردنی هەستانەوەی گیانی ئاینی، گەرچی کار بەوەش بگات بە پشت بەستن بە دۆستەکانمان توندوتیژیش بەکاربهێنن دژ بە هـەر دەستپێـشخەرییەك لـە هەسـتانەوەی گیـانی ئیـسلام لـە ناوچـەکانی دەوروبەرکان [٢]

---

[٢] عبدالعزیز : قبل ان یهدم الاقصی، الطبعة الاولی، دار الوطن للنشر ١٤١٠هـ ، ل ٢٢ .

( دیڤد بن جریۆن ) یش دەڵێ : ئێمە لە ناوچەکەدا لە هیچ مەترسییەك ناترسین جگە لە ئیسلام [٣]
شەمعۆن پیریزیش دەڵێ : ناکرێت لە ناوچەکەدا ئارامی هەبێ تا ئیسلام شمشێری پێ بێ ، لە داهاتووشمان دڵنیانین تاوەکو ئیسلام بۆ هەمیشە شمشێر نەخاتە کێلانەوە [٤]

ئەو فیکر و سیاسەتەیە کە ئەمڕۆ ئیسرائیل و زۆربەی وڵاتانی عەرەبی چنگیان خستۆتە قوڕقوڕاگەی ناوچەی غەززە و غیرەتیان ئەجولاً دژ بەو هەموو دڕندایەتیەی ئیسرائیل لە موشەکبارانکردنیان بە جۆرەها چەکی قەدەغەکراوی نێو دەوڵەتی .

بزوتنەوەی بەرگری فەلەستین – حەماس – گەر لە داهاتووشدا هەڵوێستی هەرچۆن بێ، ئەوا بۆ عەرەب و بڕیار بە دەستانی عەرەب سەلماندی کە تەنیا ئیسلام دەتوانێ گیانی غیرەتیان بە بەردا بکات، ئەوەك ئەوەی مەحمود عەبباس کە یوسی سریدی وەزیری پێشووی خوێندنی باڵای ئیسرائیل دەڵێ : ئیسرائیل مەحمود عەبباسی لە شەریکێکەوە کردە خۆفرۆش و پاشان سەرشۆڕی کرد ، هەروەهاش دەرچوو، ئەو سزادانەی بەسەر ئەندامانی حەماسدا هات وەکو ( العربیە ) پیشانی دا لە بەستنەوەی بە زنجیر و ڕوتوکردنی جەستەیان لە لایەن پۆلیسەکانی عەباسەوە، هەر ئەو دڵسۆزییەی دەبینرێ بەرامبەر ئیسرائیل و پشت کرد لە گیانی میللەتەکەی کە سەربەخۆیی و رزگاربوونی دەوێ، مەحمود عەبباسیش قوتابییەکی بچوکی سەرکردەکانی عەرەبە کە ئیسلام چقڵی چاویانە .

---

[٣] عبدالعزیز : قبل ان یهدم الاقصی، الطبعة الاولی، دار الوطن للنشر ١٤١٠هـ ، لا ٢٤.
[٤] عبدالعزیز : قبل ان یهدم الاقصی، الطبعة الاولی، دار الوطن للنشر ١٤١٠هـ ، لا ٢٥ .

## بەشی پێنجەم :
## زیندوویەتی ئیسلام و بوونی بە سەنتەری هێرش کردنە سەر:

روونە کە ژیان بێ بەرنامەیەکی ڕاست و تەواو ڕێك نایەت، خوای گەورەش پەیامی خۆی بۆ کۆتا پێغەمبەری خۆی ناردووە، پەیامی یەکتاپەرستی خوا کە دادگەری لەسەر دەوەستێتەوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت:( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) [1]

واتا : ئەمڕۆ ئاینەکەتانم تەواو کرد و ڕێساکانی کامل و نیعمەتی خۆمم بەسەرتان بەخشی لەوەی پێغەمبەر و پەیامم بۆ ئێوە نارد و ئیسلامیشم بە بەرنامە و ڕێباز بۆتان هەڵبژارد و تەنیا بە ئاینداریکردنتان بە ئیسلام ڕازی بووم . ئەمە جگە لەوەی لە سەرەتای ئایەتەکەدا چەند شتێك حەرام کراوە کە بەسودی ڕەوشت بەرزی و لەش ساغی بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە .

خوای گەورە بە جیهانێتی ئیسلام موژدەی داوە، هەروەکو وەسفی موحەممەدی پێغەمبەری بەسۆز و بەزەیی بۆ جیهان کردووە ((فَإِنْ عُثِرَ عَلَى أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يِقُومَانُ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ )) [2]

لەپاڵ خورەوشتی ئیسلامدا، پەیام و سیستەمێکی بەهێزی بە پێغەمبەرەکەی خۆی داوە و پێغەمبەریش هاوەڵانی لەسەر پەروەردە کردووە و لە ژیانی خۆشیدا بەرجەستەی جیهانێتی ئاینەکەی کردووە، شوێنکەوتەکانی بە نەتەوەیەکی تۆکمە و ڕێك کردووە لەسەر بنەمای مرۆیی

ئەوەش تایبەتمەندی ئیسلامە لە ڕێکخستنی ژیان لە گشت ڕووەکانیەوە لەگەڵ پارێزگاریکردنی ئینسانیەتی ئینسان نەك بگۆڕێت بۆ کەرەستە و ئەو کارە لە دەست بدات کە بۆی هاتووە، بەڵکو مرۆڤ مانەوەی بە پارێزگاریکردنی سیستەمێتی لە پێناو ئامانجەکانی بوونیدا [3]

---

[1] سورەتی : المائدە ، ئایەتی ٣

[2] سورەتی :الأنبیاء ، ئایەتی ١٠٧

[3] محمد قطب : الصحوة الاسلامیة ، لا ١٣٥

بانگەشە و پڕوپاگەندەیی لەسەر ئاین پێوەری هەیە لەڕاستی و ناراستی لە پەیامەکەیدا، زەمەن بۆ هەندێ جار هەڵوەشاوەیی دەسەپێنێت، بە تایبەت ئاینە ئاسمانیەکان بە بوونی ئەو پەیام و پێغەمبەرانەی کە هاتوون بەڵگەی ئەو ڕاستییەن، ئەوەی لە ئیسلامدایە بەڵگەی نەمرییەتی، خوای گەورە خۆی پارێزگاری لە ئەستۆ گرتووە کە دەفەرمووێت :

(( إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ )) [1]

واتا ئێمە بە خۆمان ئەم پەیامە ( قورئان ) مان دابەزاندووە و هەر بە خۆشمان دەیپارێزین .

پلانی شێواندنی ئەم پەیامە لە مێژوودا زۆرێک بووە، هەر لەم دواییانەشدا پلانێکی ئەمریکا ئاشکرا بوو کە شێواندنی ئایەتەکان بوو بە ناوی سێگۆشەی تەوحیدەوە ( مثلث التوحید ) بڵاوی کردەوە و لە ئەستۆ گرتنی خوایش بۆ پارێزگاری کردنی پەیامەکەی هاتە دی، بەوەی لە سینگ و دڵ و زمانی موسڵماناندا پارێزراوە .

بۆیە پارێزگاری کردنی ئەم ئاینە جیهانی و کۆتا ئاینە پێویستە، بەو پێ یەی کۆتایی هەموو شەریعەتە ئاسمانییەکانە .

موسڵمانان لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا لە رووی سەربازی و سیاسی و ڕاگەیاندن و داراییەوە لەوپەڕی ناڕەحەتیدان، ئابووریە دەوڵەمەندەکەیان داگیرکراوی دەستی دوژمنکارە . زیندوویەتی ئیسلام لە چەواشەکاریدا نیە، لە فێرکردنی خەڵکیدا نیە بۆ داوێن پیسی و شەهوەت پەرستی، بەڵکو زیندوویەتی ئیسلام لە بانگەوازیدایە بۆ یەکتاپەرستی و سەلماندن و جێ بەجێکردنی شەریعەتی خوایی، پێچەوانەی مەسیحیەت، هەروەکو خاتوو بربارابراون ئەڵێ : مەسیحیەت وەها بانگەشە دەکات کە ئاینێکی یەکتاپەرستانەیە،

---

[1] سورەتی : الحجر ، ئایەتی ٩

بەلام بە باوەڕبوونی بە سێ گانەیی ( عقیدة الثلث ) لە بیر و مێشکی موسڵماندا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە مەسیحیەت بەڕۆکەی پەرستنی یەک خوای لە دەست داوە ، ڕێبازی یەکتاپەرستیان دەست لێ هەڵگرتووە و ڕێبازی شیرکیان بە ڕێباز کردووە، چونکە دەستیان لە پەرستنی یەك خوا هەڵگرتووە ، ئەوا سیان دەپەرستن [1]

- لە تەوراتدا ئەحکامی سیاسەتی ( کاری ) ڕواڵەتی گشتی هەیە ( دەرون فەرامۆشە ) .
- لە ئینجیلدا ، کاری دەرون باس کراوە
- لە قورئاندا هەردوو کار – سیاسەت – هەیە ، ڕواڵەت و ناوەوە ( دەرون ) کە دەفەرموونێت :

( وإن تَعفُو أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلاَ تَنسَوُاْ الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ )، یان ((خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ )) ؛ ئەمانە ئەحکامی باطنین کە باس لە خوڕەوشتی لێبووردن دەکەن .

تاماژەش بۆ سیاسەتی ڕواڵەتی ئەم فەرمایشتەی خوایە : ((وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ )) .

بەربارا براون ئەڵێ : ئیسلام ئاینێکی سادە و ئاسانە، بیر و باوەڕی تەمومژاویی و نامەنتیقی تیادا نیە و لەسەر ئەو جۆرە دانەمەزراوە، لە ئیسلامدا کەهنوتی و قەشە و چاودێری ئاین یان کەسی پیرۆز نیە، لاهوت لە ئیسلامدا شوێنی نیە، چونکە ئیسلام ڕێگە و ڕێبازی ژیانە نەوەك وشە ڕیز کردن [2]

---

[1] براون ، بربار : نظرة عن قرب في المسيحية ، لا ٣٩ .
[2] براون ، بربار : سەرچاوەی پێشوو ، لا ٩٩ .

ئیسلام بۆ دەرخستنی ڕاستەقینەیی ڕێباز و ئەوەی لە بیر و باوەڕدا لای بێباوەڕان هەیە تەحەدای بێباوەڕانی سەردەمی موحەممەدی پێغەمبەر دەکات ( صلی الله علیه وسلم )، بۆیە لە قورئاندا ئایەت گەلێکی تەحەداکارانە دەبینین وەکو : (( وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ )) [٣]
واتا ئەگەر ئێوە لە گومان دان لەبارەی ئەو قورئانەی بۆ بەندەی هەڵبژێردراومان دابەزاندووە، ئەوە بە سورەت و نمونەیەکی هاوشێوەی تەحەدای بکەن و لە پاڵپشت و یارمەتیدەرانتان جگە لە خوا هاوکاری بخوازن، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن

تەحەدای ئەو ڕۆژە بۆ هەمان ئەمڕۆی ئێمە و نەوەکانی داهاتوو زۆر لەبارە، کاتێك زانایانی ڕۆژئاوا قسەیان لەسەر سوڕانەوەی زەوی و زانستە گەردوونییەکانی دیکەیان دەکرد، لەلاین قەشە و مۆڵەت پێدراوە خواییەکانەوە ! ئەوپەڕی سزا دەدران، قورئان ئایەت گەلێکی لەخۆ گرت کە باسی لە گەردوون و سروشتەکەی بوو، هەر ئەم قورئانەش بوو لە شارستانییەتی ئیسلامیدا مرۆڤی ئەوروپی لێی بەهرەمەند بووە

لە سایەی وەها دەسەڵاتێکی بیروباوەڕ شاراوە دەبێ چ پێوەرێك هەبێ بۆ نوێنەرایەتی کردنی بەرنامەیەك کە ئاسمانی بێ ؟ ! . ئیسلام ، پێغەمبەر گەیاندوویەتی, بە شوێنکەوتەکانی، بەدەر لەوەی هیچ کەسێك نابێتە نوێنەری خوا بەسەر ئەوی دیکەدا بە جۆرێ لە پاڵ خوا و نێردراوەکەیدا ببێتە بڕیاردەر .

زیندوویەتی ئەم ئیسلام وەهای لە جولەکە و گاورەکان کردووە ئیرەیی پێ ببەن کەبووەتە شوێنکرەوەیەکی شەرعی بە جۆرێك بە ناپاکی کردنی خۆیان ماف رابردوویان لە دەست چووبێ، گەر نا بۆ چ ئەو پلانە نامرۆڤ و نا ئەخلاقییانە بەرامبەر تاك و کۆمەڵگەی موسڵمانان بەکار دەبەن ؟

---

[٣] سورەتی : البقرە ، ئایەتی ٢٣

کاتێک مرۆڤی باوەڕدار لەبارەی پێغەمبەرانەوە ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) دەدوێت، سەلامی خوایان لەسەر دەدات و بەو ناوە جوانانەوە ناویان دێنێ کە خوا و ئەخلاق پێیان جوانە، ئەوە ڕێزێکە خوا لەسەر موسڵمانانی پێویست کردووە و موسڵمانیش بە شانازییەوە باسیان دەکەن، چونکە ئەوانن میراتگری ڕاستەقینەی پەیامە نەمرەکانی ئاسمانن و گۆشکراوی ئیسلامن .

لە ئیسلامدا لە بابەتی باوەڕدا کە ئاینەکەی لەسەر دامەزراوە هەڵاوێردەکردنی پێغەمبەران قبوڵ نیە، هەموو پێغەمبەران نێردراوی خوان و خۆشەویستیان لە دڵی موسڵماناندا نەخشێنراوە، ئەوەش بەڵگەی زیندوویەتی ئیسلامە کە ئاینی یەکتاپەرستی یە .

سەید قوطبی ڕەحمەتی ئەڵێ : ئاین لە لایەن خواوە هاتووە تاوەکو بەرنامەی ژیانێکی واقیعی بێ، بیپارێزێ،نەهاتووە تاوەکو باوەڕێکی وشک بێ و لە ویژداندابێ، نەك هەر لە میحرابدا ئەنجام بدرێ .

ژیانی مرۆڤ و گرنگی پەروەردەکردنی و بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی ژیان، هیچ گرنگییەکی نابێ تاوەکو لەسەر بناغەی بەرنامە و سیستەم و شەریعەتێك نەچەسپێ لە ژیاندا کردارانە ئەنجام نەدرێت و خەڵکی لەسەر لێپرسینەوە نەکرێت و پاداشت نەدرێ

ئەوە لە ئیسلامدا هەیە، لە هەر بوارێکدا وەڵامی هەیە و واقیعیانە وەڵام دەست دەکەوێت، تەنانەت لە مەسیحیەت و یەهودییەتدا باسی دارایی نەهاتووە، سیستەمێك نیە، کەچی لە ئیسلامدا سیستەمێکی دارایی بەهێز دەبینینو لەمڕۆی قەیرانی دارایی جیهاندا وڵاتانی ڕۆژئاوا دارایی و ئابوری ئیسلامی بە باشترین چارەسەر دەزانن بۆ سیستەمی بانکی .

ئەو سیستەمە کە دکتۆر بالمەی سەرۆك وەزیرانی سوید لە ساڵی ١٩٨٤ ز کە سەرۆکی حیزبی زۆرینەی پەرلەمان بوو بانگەوازێکی

مێژوویيانەی ترسناکی گەلی سویدی کرد بەوەی ساڵ ۱۹۸۵ بکەنە ساڵی ناسینی ئاینی ئیسلام بەوەی ئاین و شارستانییەت و سیستەم و چارەسەی تەنگەژە ژیاری و ئەخلاقییەکانە، بۆیە کە ورد دەبینەوە سەرەڕای تەنگەژە دروستکردن بۆ بانگەوازەکە، لە ئەورووپادا کەسانێکی زۆر دەبنە موسڵمان و لە موسڵمان بوونیاندا پیلانێك نیە، چونکە موسڵمان بوون پاداشتێکی ماددی دەست ناخات، جگە لە دەسکەوتی ئەخلاقی و ئینسانی، ئەوانەش کە تاك و تەرا لە ئیسلام دەتۆرێن جگە لە کێشەی ماددی و شەهوەتبازیان لە هەگبەدا پیّ نیە .

ساڵی ۱۹۰٤ تیۆدۆر هیرتزل، باوکی ڕۆحی سەهیۆنیەت چاوی کەوت بە پاپا بیویسی دەیەم و ئامانجی بزوتنەوەی سەهیۆنیەتی بۆ شیکردەوە و داوای هاوکاری مەعنەوی لیّ کرد، پاپا ئەو داواکارییەی ڕەتکردەوە بەو بیانووەی جولەکە دانی بە مەسیحی گەورەیاندا نەناوە، بۆیە ئەوانیش هاوکاری جولەکە ناکەن .

ڤاتیکان هەر لە سەرەتاوە دژایەتی چەسپاندنی پەیامی بیلفۆر و دامەزراندنی قەوارەیەکی جولەکەی لە فەلەستین کرد و فراوانبوونی نفوزی جولەکەی لە ناوچەکەدا لەسەر بەرژەوەندی مەسیحیەت ئەژمار کرد و لە ساڵی ۱۹۲۲ ڤاتیکان یاداشتنامەیەکی ئاراستەی کۆمەڵەی نەتەوکان کرد و تیایدا ڕەخنەی لە بیرۆکەی دروست کردنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە فەلەستین گرت و لە ساڵ ۱۹٤۳ یاداشت نامەیەکی بە ئەمەریکا دا و دژایەتی خۆی لەو بارەیەوە ڕاگەیاند، لە سەردەمی بیوسی دوانزەیەمیشدا جولەکە هیچ سودێکی لە بڕیاری ڤاتیکانی مەرجعی کاسۆلیك مەزهەبەکان نەکرد و جولەکە ئەویان بە تۆمەتبار دەزانی لە قەسابخانەی نازییەت دژ بە جولەکە، بە مردنی پاپا هەڵوێستی ترسناك لە هەڵوێستی ڤاتیکان ڕوویدا، پاپا یۆحنای بیست و سێیەم جێگەی گرتەوە، لە ساڵی ۱۹۵۸ یشدا

گفتوگۆ کەوتە نێوان جولەکە و مەسیحیەت و بەو بۆنەشەوە کتێب و نوسراوی لێك گەیشتن بڵاو بوویەوە، تەورات و ئینجیل پێکەوە کۆکرانەوە و ناونران بە ( کتێبی سەردەمی کۆن و نوێ ) .

هەر ئەم پاپایە لە ماوەی ۱۹٦۲ – ۱۹٦٥ قەواڵە نامەیەکی دەرکرد و لە بەرامبەر لە خاچدانی مەسیح لە جولەکە خۆش بوو، راشیگەیان کە پێویستە کاسۆلیك دان بنێت بە واتای دەوڵەتی ئیسرائیل، بۆیە لەو مێژووەوە تاوەکو ئێستا ڤاتیکان، سەری کاسۆلیك مەزهەبەکان لە برەوداندان بە جولەکە و دەوڵەتی ئیسرائیل، بەدەر لە بەرچاوگرتنی رابردوویان و ئەو مەسیحیانەی دیکە کە لە قودسدان،مەسیحەکانی فەلەستین پشت گوێ خراوی ڤاتیکانن و ساڵی( ۲۰۰۹ ز ) داوایان کرد بۆ گوشار خستنە سەر ئیسرائیل هیچ بەرهەمێکی ئیسرائیل نەکڕدرێت .

قەواڵە نامەکەی تا ئەو ئاستە گەیشت، کە لە ڕوودانی کارەساتی هۆلۆکۆستدا وەکو مەرجەعی مەسیحیەت بێ هەڵوێست بوونە ، ئەوە گەرچی دڵنیا بوونیان بووە بە لە دەستچوونی فەلەستین، بەوەش گەیشتوون کە بە دورخستنەوەی ڕێژەیەکی زۆری جولەکە ئەوا دەتوانن کاری ئاینیان لە ئەوروپادا سەلامەتی بمێنێتەوە [۱]

ئەمریکاش لە ڕووی سیاسیەوە ئەمانەی خواردوە بۆ ئیسرائیل دەکات :

١. گرنگی دان بە ستراتیژییەتی ئیسرائیل لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکان و ڕۆژئاوا و بەدەمەوە هاتنی دەزگا ئەمریکیەکان بۆ داواکاری سەربازی ئیسرائیل و باڵا دەست کردنی بەسەر وڵاتانی عەرەبدا .
٢. ڕوانینە ئیسرائیل بەوەی کە تاکە وڵاتی دیمۆکراتییە لە ناوچەکەدا و دەرخستنی هاوپەیمانێتی ئەمریکاو ئیسرائیل .

---

[۱] لە ئینتەرنێتەوە ( هداية الحيارى ) : قصة احتراق اليهودية للفاتيكان . مێژووی ۲۹ / ۲ / ۱٤۲٤ ك .

٣. یەکبوون لەگەڵ ئیسرائیل لە سیاسەتی باڵای ئیسرائیل و هەڵوێست و ڕووداوەکانی ڕۆژ و هەندێ جاریش بیانوو هێنانەوە بۆ هەڵس و کەوتەکانی ئیسرائیل .
٤. پڕوپاگەندەکردنی پەنهانی و بیانووکاری بۆ سەهیۆنیەت و ڕوانینە عەرەب بۆ خەڵکی فەلەستین بە چاوێلکەی ئیسرائیل .
٥. ڕەواجدان بە موعجیزەی یەهودییەت لە بونیاتنانی دەوڵەت و ڕووبەڕوو بوونەوەی تەحەداکان [٢]

غربیل بایر لە توێژینەوەی کۆمەڵگەی عەرەبی دەڵێ : ئاین و سیاسەت لە ئیسلامدا یەکەیەکی تەواو پێك دێنن بە باسکردنی شێوەی سیاسەتی ئیسلامی،وەهابیەت لە حیجاز و ئیخوان موسلمینی میسر و سیستەمی خەلیفە لای مەهدییەکانی سۆدان و سەنوسی لیبیا و دەوڵەتەکەی عبدالقادری شێوە ئیسلاحی جەزائیر و بیروباوەڕی سەلەف مەغرب و ... پاشان باس لە بابەتی زانا موسڵمانەکان و ڕۆڵی سیاسیان دەکات و دەگاتە ئەوەی کە زانا سونییەکان جگە لە فەلەستین ئەوا ڕۆڵێکی سەرکردەییان نەگێڕاوە لە بەرگری دژ بە هێزەکانی بێگانە [٣]

---

[٢] ابراهیم عبدالکریم ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٥٢ .
[٣] الاستشراق ، لا ٢٠١

## دەستهات(کۆتایی)

ئــەوەی لــە باســەکاندا رابــردوور روونــی دەکاتــەوە کــە ئــاین پێویستییەکی مرۆییە بۆ مرۆڤەکان لە ڕێکخستنی ژیان و بیرکردنەوەکان و ئاوەدانکردنــەوەی زەویــدا، لەوەتــەی مــرۆڤ هەیــە پــەیامیش هــەبووە، نەیهێشتووە خۆی نەداتە پاڵ بیروباوەڕێك، بیروباوەڕ بۆ مرۆڤ لە هەموو شت گرنگتر بووە، تەنانەت وەکو ئەوەی لە ئێستاشدا هەندێ میللەت ( مەزهەب ) هەموو بوونی دەداتە دەست ئاژەڵێك و پارێزگاری و سەلامەتی لەو ئاژەڵەدا دەبینێتەوە

خــوای گــەورە پــەیامی خــۆی بــە مرۆڤــەکان داوە و پێغەمبــەری بــۆ ناردوون تاوەکو لــە مەبەست و نــاوەڕۆکی پەیامەکە شارەزا بن، ئەوەشی لــە نێو ئەو پەیامــەدا هــاتووە تــەنیا پارێزگاری کردنــی بەشی بوونی مرۆڤــە، لەوەی ژیری بەکاربهێنن و یەك خوا بپەرستن و لەنێو یەکدا برایانــە مامەڵــە بکــەن و سروشــتی شــەیتانانە پــەنا پــێ نەبــەن، پــاك بمێننــەوە و وەکــو ئــەو دەرونە پاکەی پێ ی هاتوونەتە دونیاوە

لەوەتەی مرۆڤ هەیە تەنیا یەك پێغەمبەر بوونی نەبووە، هەندێ جار سروشتی مرۆڤەکان زۆر بە زوویی شوێنەواری ئەو پەیامەیان سڕیوەتەوە و لەبــەردەم نەوەیــەکی دیکــەدا نەناســراو و نــەزانراو بــووە، یــاخود دەســتی بەرژەوەنــدی خــوازانی پــێ گەیــشتووە و تێکــەڵ بــە بەرژەوەنــدی کــراوە و ڕەسەنێتی ئاسمانی لەدەست داوە، هاتنی ئەو پێغەمبەرانەش لای کەسی ژیر و فامکەرەوە هەر ئەوەی لێ دەگەیەنرێ .

مرۆڤ کە دەروونی هەیە و شەیتانیش کە دوژمنێکی سەر سەختە بۆی لــە دروســتکردنییەوە، هەمیــشە لەبــەردەم دوو ڕێگەیــەدا، ڕێگەیــەك چاکە و خواویستیە کــە بەرهــەمی گــەورەی پــیرۆز بــۆ مرۆڤایــەتی دێنێتــەدی، ئــەوی دیکــەش هەڵــدێرو ســواربوونی کــەلی شــەیتانە کــە زیــان و نەهامــەتی و کەلەشەقی دەخولقێنێ

پێغەمبەران کە هاتوون خەڵکانی ئەم دوو ڕێگەیان ناسیووە، ئەوەی نەیویستووە خۆی بداتە دەست بیرکردنەوەیەکی ستەمکارانە و نەیویستووە مرۆڤە هاوشێوەکەی بۆ بێتە خوا و ئاغای، زوو بە زویی ئاشنایەتی پەیامەکە و پێغەمبەرەکەی وەدەست خستووە، ئەوی دیکەش کە بەرژەوەندییەکەی رووە و هەڵدێری چووە و میراتە مەزنەکەی باو باپیرانی لەوەی بت پەرستی بە میرات بۆماوەتەوە بەجێ نەهێڵێ، کەوتۆتە دژایەتی و ململاتێکردنی، بڕیاریش لەوەدا نەمانی خۆیەتی یان پێغەمبەرەکە، ئەوەش لە ژیانی پێغەمبەراندا زۆر بە جوانی دەبینرێت، لە دژایەتی کردنی نوح و لوت و ساڵح و هود و موسا و عیسا و پێغەمبەری کۆتاش کە موحەممەدە ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) مێژوو خۆی دووبارە کردووەتەوە، مەبەستیشمان مێژووی ئەو دوو ڕێگەیەیە کە مرۆڤ لە کۆنەوە نەریتی کردووە و زەمەنەکانیش لێ ی بێ بەش نابن !

ئاین بۆ مرۆڤ شتێکی سەیر نیە، ئاینە ئاسمانییەکان و هەموو ئەو ڕێچکە و ڕێبازانەی دی لە چوارچێوەی ئایندا کۆ دەبنەوە، ئەوەی زەمینی بێ سوود و زیانی بۆ خۆیەتی، ئەوەش ئاسمانی بێ پاداشتی ئاسمانی بۆ هەیە، درێژ و کورتکردنەوەی و دابڕین و خستنە سەر، لە ئاینی ئاسمانیدا بواری مرۆڤی تیادا نیە . مرۆڤ باش دەزانێت کە دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوا، تایبەتمەندی و بیرکردنەوەی هەیە ، بێگومان کە خوای گەورە ئەوانەی پێ بەخشیوە بێ مەبەست نیە، پەیڕەو کردنە، پەیڕەوکردنی بەرنامەی خوایە لە ژیاندا، ئەو بەرنامەیەش بە درێژایی هەزاران ساڵ پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە بە مەبەستی ڕونکردنەوەی ژیان بە ڕەسەنێتی سروشت و خۆرسکی پاك و حەقیقەتی بوون، سەرچاوەکانی ئەو ئامانجە سەرەکیانەش پەیامەکەیە کە وەحدانییەتی خوا و دورکەوتنەوەیە لە شیرك و خراپەکاریە کەبەوێرانە دەگەڕێتەوە سەر کۆمەڵگە ،

موحەممەدی پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) دەفەرمووێت :

( الأنبیاء إخوة ودینهم واحد ) [1]

واتا : پێغەمبەران بران و ئاینەکانیشیان یەك ئاینە .

---

[1] رواه ابو هريره .

جولەکە و نەسرانیەتی سەردەمی پێغەمبەرەکانیان و ئیسلام، یەك بەرنامەی ئاسمانین کە تیایدا خوای گەورە داوای ژیانکردن دەکات بەوەی بە پێی ئەو بەرنامە ساغ و راستەبیّ کە عەقلی ساغ راستی دەخاتەوە و دەرکی دەکات: ((وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ )) [1]

واتا : بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکمان ناردووە کە تەنیا خوا بپەرستن و لە ستەمکاران و ستەمکاری دووربکەونەوە، جا هەندێ لەو نەتەوانە خوای گەورە رێنمونی کردوون و هەندێکی تریان نکوڵیان کردووە و لە گومراییدا ماونەتەوە، جا ئێوەش بەسەر زەویدا بگەڕێن و پاشەڕۆژ و شوێنەواری درۆزنان ببین و پەندیان لێ وەربگرن .

یان دەفەرمووێت : ((وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاء رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ )) [2]

واتا : بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێك نێردراوە، هەرچ کاتێ پێغەمبەریان بۆ هاتبێ دادگەری خستۆتە نێوانیانەوە و ستەمیان لێ نەکراوە

رووبەڕووی بوونەوەی هەموو زیادەڕۆییەك ( طاغوت ) فرمانێکی خواییە پێویستە ئەنجام بدرێت، چونکە چاکبوونی کاروبارەکانی ژیانە زیادەڕەو هەوڵی بە کۆیلەکردنی خەڵکی دەدات و سنوری بەها ئەخلاقییەکان دەبەزێنێ، گەر هەلی بۆ رەخسا ژیان دەکاتە دۆزەخ، ئەو مەبەستەشە کە جولەکە و نەسرانییەتی ئەمڕۆ پەیڕەوی دەکەن، جیهانیان بە سەروەت و ئارەزوو دەستەمۆ کردووە، نەك بەو بیروباوەڕەی حەقیقەتی تیادا نیە و جگە لە سەرگەردانی هیچ شتێك بە ژیری مرۆۋ نابەخشن، بە عەقڵی شەیتانی و کەرەستەکانی شەیتانەوە لە نەمانی رەوشت و یەك خوایی و مرۆییەوە هەوڵی سەرگەردانکردنی دەدەن، لە هەرکوێدا پاکی و رێز بێ دژی دەوەستنەوە

---

[1] سورەتی : النحل ، ئایەتی ٣٦

[2] سورەتی : یونس ، ئایەتی ٤٧ .

ئەمڕۆ ئەوان بە فڕۆکە و موشەك و دەبابە و هەزار چەکی وێرانکەر وڵاتان کاول و داگیردەکەن، ئاشکرا و نهێنی سەروەتی میللەتان دەدزن، دەزگا هەواڵگری ومرۆڤ کوژەکانیان بە خزمەتگوزار و مرۆڤدۆست و ڕێزی مرۆڤ ناودەبەن ! ئاخۆ ئەمەیە گرنگی ئاین !!؟ ئاخۆ کە ئاینی ئەوان کە تەنیا بۆ جولەکەیە چۆن خوایەکی گەورە ڕێگەیان دەدات بەندەکانی دیکە بکوژرێن و برسی بکرێن ؟ تەنیا ئەوە نەبێ کە لە تەوراتەوە شێوێندراوەکەیاندا هاتووە کە خوای گەورە بۆ گەلەکەی خۆی ( جولەکە ) میللەتانی دیکەی بە خزمەتکار و ژێر دەستە دروستکردووە

ئاینی ئیسلام، ئاینێکی تایبەت بە میللەت و نەتەوەیەك نیە، جیهانی و گشتییە هەموو مرۆڤێك دەتوانێ شوێنکەوتەی بێ، بەبێ ڕوانینە ڕەگەز و پلە و پایە و ... هتد .

ئاینێکە مرۆڤ دەتوانێ پێیەوە شکۆمەند بێ و بۆ هیچ کەسێ جگە لە خوا ملکەچ نەبێ .

ئامانجی ئیسلام پارێزگاری کردنی مرۆڤە لە پلە و پایەکەی و ناسینی حەقیقەتی بونێتی، بنەماکانی ئیسلام چ لە بواری عەقیدە و ئەحکامەکانی تایبەت بە تاك و کۆمەڵگە تاوەکو ئێستا ڕەسەن و پارێزراوە، بەچاوی تەماح و سەروەت و بەکاربردنەوە ناڕوانێتە کۆمەڵگە و میللەتان، وەکو ئەوەی جولەکە و بەناو مەسیحییەکان لەو غەزوە فیکری وسێکسی و سەربازی و سیاسییەوە دەیکەن و جگە لە سەروەت و باڵا دەستی، هیچ بەهایەکی بەلاوە گرنگ نیە ، گەرچی ئەو باڵادەستیەش بە کۆتایی هاتنی ژیانیش بگات و کاولکاری بخاتەوە، لەو جەنگەشدا ئیسلام ئامانجی سەرەکیانە، هەروەکو ( ئیوجین ڕۆستۆ ) ڕاوێژکاری سەرۆك جۆنسۆن ساڵی ١٩٦٩ بۆ کاروباری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەڵێ : بارودۆخی مێژوویی دوپاتی دەکاتەوە کە ئەمریکا بەشی تەواوکەری جیهانی ڕۆژئاوایە ،

له بیروباوەڕ و فەلسەفە و سیستەمی ، ئەمەش وەها دەکات دژ بە ڕۆژهەلاتی ئیسلامی بوەستێتەوە لە فەلسەفە و عەقیدەکەی کە لە ئاینی ئیسلامدا خۆی دەبینێتەوە، ئەمریکا بە خۆی ناتوانێ دژ بە ئیسلام بوەستێتەوە، تەنیا لەپاڵ جیهانی ڕۆژئاوا و دەوڵەتی سەهیۆنیەتدا نەبێ، گەر پێچەوانەی کرد، ئەوە زمان و فەلسەفە و روناکبیری و دامەزراوەیی خۆی ڕەتکردۆتەوە .

ئەو میراتەی کە بۆ ڕۆژئاواییەکان ماوە، ئاینی مەسیحیەت وجولەکەیە، ئەوان لە زووەوە لەو جەنگەی لە ئەنجامدانیدان بەفیکر و سیاسەت وسەربازیان بە جۆر گەلێك ئەنجام داوە، توانیویانە سود لە زۆر خاڵی لاواز وەربگرن کە نەدەبوو مرۆڤی موسڵمان لەبیری وەهادا وشیار نەبێ، وەکو ئەو سەرەتا پەرتەوازیەی کە ئەتاتورکی جولەکە توانیی قەوارەی موسڵمانان لەنێو بەرێ، بەرپاکردنی جەنگی ئەو بەرامبەر یۆنان و هەڵگرتنی هەندێ دروشم، توانی زۆرێك خەڵك ساوێلکە بکات، وەکو ئەوەی شاعیرێکی میسری بە هەموو متمانەیەکییەوە داوا دەکات میسر و خەڵکەکەی وشیار بێتەوە و ئەتاتورك بێتە پێشەوای، وەکو دەڵێ

انهظي يا مصر كي تحمى الهلال لبى نداء المصطفى الغازي كمال

ئەو تێگەیشتنەی نێو کۆمەڵگە و تاکی موسڵمانان بە پێچەوانەی توانای بیری رابردوویان، زۆرێك کەلێنی خستۆتە نێو بیر و بۆچوونیانەوە، مێژوویان تەمومژاوی دەبینین، لەڕووی ڕۆشنبیری و فیکر و بیروباوەڕەوە نەشارەزایانە هەنگاو هەڵدەگرن، فیتی دوژمنانیان بەلاوە ساغ و حەقیقەتە !

خیلافەتی ئیسلامی کە سەری موسڵمانە لەلایەن بیریارە بێگانە مەبەستدارەکان و ناوخۆییە پێنەگەیشتووەکانەوە زۆردارانە پێناسە دەکرێت، ئەوەش بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆی وەرنەگرێتەوە و لە ململانێی و ئایندا موسڵمانان لە نەهامەتی و سەرگەردانیدا بن، کەچی هەردوو مێژوو نوس لاڤیس و رامبو دەڵێن : حکومەتی تورکەکان بەرهەڵستی هی ئاینێك نەبۆتەوە، بەڵکو ئیمتیازیان بە کڵێسای ئەرسەدۆکسیش داوە [1]

---

[1] الأسرار الخفية وراء إلغاء الخلافة العثمانية ، لا ١٠٣

هەروەکو ئیدوارد سەعید دەڵێ : پەنابردنی فەرمانڕەوا بۆ داپڵۆسین یان داگیرکردنی ئازادییەکان و بوونی دەسەلآت لە دەستی کەمینەیەك کە نوێنەرایەتی گەل دەکەن و بە درۆ و ستەمەوە وەهای دادەنێن کە پرۆژەیەکە و لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە، یان لە پاساوداندا قسە دروست دەکرێت کە ئەو جۆرە دەسەلآتە بنەما گەلێکی ئیسلامیان هەیە، کەچی وەکو ئاینە جیهانی و گەورەکانی تر، بیروباوەڕی ئیسلامی لە گشت ئەوانە بەدوورە [٢]

ئەو قسە و گفتوگۆیانە تەنیا بۆ گوشار خستنە سەر جەماوەر و ناشیرینکردنی دەسەلآتی ئیسلامیە و کەنارخستنی ئیسلامە، دیارە لەوەشدا بێ ڕۆڵکردنی خەڵکە موسڵمانەکەیە، هەروەکو شەمعۆن شەمیر دەڵێ : لە جیهانی عەرەبدا کۆمەڵێك هەیە هەوڵی یەکلایکردنەوە لەگەڵ ئیسرائیلدا دەدەن، بەلآم کۆمەڵێکی پەراوێزخراون لەسەر شانۆی بڕیاردا ئەمڕۆ کاریگەیان نیە، بەلآم هەن، بە پێویستی دەزانم کە ئەوانە بە جەماوەریان بزانم

هەورەکو وتراوە :

كيف احتراسي من عدو إذا

كان عدوي بين اضلاعي

دوژمن لە هەموو لایەکەوە لەم ململانێیەدا بەشدارە، دیارە ئەمەش نەك تەنیا جەنگی ئاینی بێ و بەس، بەڵکو جەنگی کلتوریشە و زۆرێك بیر لەم جەنگەدا دژ بە کلتوری مرۆڤانەی میللەتەکەی لە جەنگدایە، هەستەکان دەکوژێ و رابردووی موسڵمانان سەر و لێژ دەکات، ئەو سەر و لێژ کردنەش

[٢] ئیدوارد سەعید : سەرچاوەی پێشوو ، لا ٧١

بنەمایەکی راستەقینەی نیە، تەنیا ئەوەیە بە هەستی لاوازییەوە کەوتۆتە وێزەی هەست و گیانی میللەتی خۆی، وشەیەکی پێ رەوا نیە لە بەرامبەر گەورەیی ئیسلامدا وترابێ، گەرچی نـاوی بێژەرەکەشی بێگانە و رۆژئاواییانەش بێ وەکو ئیدوارد و جیبۆن و، لیۆن تۆلستۆی کە دەڵێ، هەر کەس بیەوێت لە ئاسانی ئاینی ئیسلام تێبگات، ئەبێ بە وردی قورئان توێژینەوە بکات، کەچی هەندێ کەس هەیە بە ناوهێنانی وشەی قورئان لاقرتێ دەکەن !

ئەرکی سەرشانی موسڵمانانە کە لە رابردووی خۆیان شارەزا بن، رۆڵی خۆیان بدۆزنەوە، زاناکانیش گیان لەسەر دەستانە خزمەت بکەن و مادده نەکەن سەنگی هەموو شێك، گیان بکەنەوە بەری خۆیان و رۆڵەکانی ئەم میللەتە، دڵسۆزانە بۆ یەکتری بتوێنەوە، تاوەکو سەرکردە گەلێك دروست بێت وەکو عومەری کوڕی خەتتاب تا سکی موسڵمانان تێر نەبێ گوێ بە قۆڕەی سکی خۆی نەدات، موسڵمانان پێویستیان بە وەها ئەخلاقێکە، بیر و باوەڕ و ئەخلاق بەهای ئەم ئوممەتەیە، مرۆڤ بێ ئەو دوانە لە سەرکەردانی و ونکردنی خۆیدایە، بۆیە مەلا و مامۆستا و شارەزاکانمان پێویستە توانای بیری ئەو زانایانەی پێش خۆیان زیندوو بکەنەوە، لە داهێنان و نوسین و لێوردنەوەو بیر تیژی و پێشەوایەتیکردنی میللەتێك کە سەربەخۆیی و ئازادی مافی خۆیەتی و خوا ئازادی پێداوە .

## سەرچاوە عەرەبییەکان


١. القران الكريم

٢. ابن كثير : قصص الأنبياء ، قدم له ، عبدالقادر الارناؤوط ، الطبعة الرابعة ، ٢٠٠١ م

٣. العهد الجديد ،الطبعة الرابعة ، بيروت – لبنان ، ١٩٩٢ م .

٤. الشهرستاني ، ابى الفتح محمد بن عبدالكريم بن ابي بكر احمد :الملل والنحل ، تحقيق : امير علي مهناد، علي حسن فاكور ،الطبعة السابعة ، دار المعرفة بيروت – لبنان ١٤١٩ هـ – ١٩٩٨ م .

٥. إبن القيم الجوزي: هداية الحيارى في أجوبة اليهود والنصارى، حققه و علق عليه:سيد عمران، دار الحديث القاهرة ١٤٢٢ – ٢٠٠٣ م .

٦. السيوطي : مفردات تفسير و بيان أسباب النزول ، اعداد الدكتور حسن الحمصى ، دار الرشيد دمشق

٧. الانجيل ، كتاب الحياة ، عربي – انجليزي ١٩٩٢ Fourth Printing .

٨. الرازي ، محمد بن ابي بكر عبدالقادر : مختار الصحاح ، دار الكتاب العربي بيروت – لبنان .

٩. معجم الوسيط ، مجمع اللغة العربية ، الطبعة الثانية ، دار الدعوة استانبول – تركيا ١٩٨٩ م .

١٠. احمد ديدات : هل الكتاب المقدس كلام الله ؟ ترجمة : نورة احمد النومان ، الطبعة العربية ، كلية التوصية الاسلامية ، ١٩٨٧

١١. انجيل برنابا ، ترجمة د . خليل سعادة .

١٢. الشرباصي ، د احمد: يسألونك في الدين والحياة ، الطبعة الأولى ، دارالجيل – بيروت ١٤٠١ هـ – ١٩٨١ م .

١٣.براون ، بربار : نظرة عن قرب في المسيحية ، ترجمة المهندس مناف حسين الياسري – كندا ، نشر التوحيد – مطبعة الصدر ١٤١٦ هـ – ١٩٩٥ م

١٤.ابي عز الحنفي مختصر العقيدة الطحاوية ، تحقيق الشيخ: محمد ناصرالدين الألباني ، الطبعة الثالثة

١٥.احمد ديدات المسيح في الاسلام ، ترجمة على الجوهري ، دارالفضيلة ، ١٩٩٠ م

١٦. شارل جينبير : المسيحية نشأتها و تطورها ، ترجمة الامام الأكبر عبدالحليم محمود شيخ الاسلام ، المكتبة العصرية صيدا – بيروت .

١٧. ابراهام ليون :المفهوم المادي للمسالة اليهودية ، ترجمة : عماد نويهض ، دار الطليعة ، بيروت ١٩٦٩ م .

١٨. محفوظات قمران – البحر الميت،كتابات ما بين العهدين .

١٩.من الفكر الصهيوني المعاصر : مركز الأبحاث ، منظمة التحرير الفسطينية ، بيروت – لبنان ١٩٦٨

٢٠. ا د : مصطفى حلمي :الأسرار الخفيفة وراء إلغاء الخلافة العثمانية ،تقديم : محمد بن اسماعيل المقدم ، دار ابن جوزي – القاهرة .

٢١.ابراهيم عبدالكريم : الاستشراف و أبحاث الصراع لدى اسرائيل ، الطبعة الأولى ، دار الجيل للنشر ١٩٩٣م .

٢٢.الموسوعة الميسرة للأديان والمذاهب المعاصرة، الندوة العالمية للشباب الاسلامي ، الرياض ١٩٧٢ م .

٢٣. اسماعيل گيلانى : فصل الدين عن الدوله ، الطبعة الأولى ، المكتب الاسلامي – بيروت ١٤٠٠ هـ – ١٩٨٠ م

٢٤. ماهر احمد اغا : اليهود فتنه التاريخ ، مكتبة قرطبة ٢٠٢٢ م .
٢٥. الخطر اليهودي ، بروتوكولات حكماء صهيون محمد خليفة التونسي ، دار الفقة للطباعة والنشر ، ١٤٢٦هـ – ٢٠٠٥ م .
٢٦. الشلبي : محمد مصطفى المدخل في التعريف بالفقة الاسلامي و قواعد الملكية و العقود فيه ، دار النهضة العربية ، بيروت – لبنان ١٩٨٥
٢٧. القرضاوي ، د يوسف : المبشران بانتصار الاسلام ، الطبعة الأولى ، مؤسسة الرسالة ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠
٢٨. الفيروز أبادي ، العلامة مجدالدين محمد بن يعقوب : القاموس المحيط ،تحقيق: مكتب تحقيقات التراث في مؤسسة الرسالة ، باشراف محمد نعيم العرقوسي ، الطبعة السادسة ، دار مؤسسة الرسالة ، بيروت – لبنان ١٤١٩ هـ – ١٩٩٨
٢٩. قاسم عبده قاسم : ماهية الحروب الصليبية ، مطابع السياسة – كويت – ١٩٩٠ م
٣٠. بيجوفيتش ، علي عزت : الاسلام بين الشرق والغرب ، مؤسسة العلم الحديث ، بيروت – لبنان .
٣١. مصباح محجوب : بيت العنكبوت ، ( تناقضات و صراعات و سلبيات المجتمع الاسرائيلي ) ، الطبعة الأولى ، دار الفكر بيروت – لبنان ١٤٢١ هـ –٢٠٠٢ م .
٣٢. حجة الاسلام ، الإمام عزالدين : ترغيب أهل الاسلام في سكنى الشام ، تحقيق محمد شكور بن محمود الحاج امير المياديني ، مكتبة الوطنية – بغداد ١٩٨٧

٣٣. أ . د . علي بن إبراهيم الحمد النملة : التنصير، مفهومه و أهدافه و سبل مواجهته ، الطبعة الثانية ، مكتبة القومية ١٤١٩ هـ - ١٩٩٨ م .
٣٤. الرفاعي ، فؤاد بن سيد عبدالرحمن : حقيقة اليهود ، الطبعة الثانية .
٣٥. سيد قطب : الاسلام و مشكلات الحضارة ، دار الشروق .
٣٦. محمد قطب : الصحوة الاسلامية ، الطبعة الأولى ، مكتبة السنة ١٤١١ هـ ١٩٩٠ م .
٣٧. ابو بلال : قوارب النجاة في حياة الدعاة ، دار الرسالة .
٣٨. المودودي ، ابو الأعلى: المصطلحات الأربعة في القران ، الطبعة الثانية ، دار الرسالة .
٣٩. د . محسن عبدالحميد : اليهود و تفجير الجنس .
٤٠. ادوارد سعيد : تغطية الاسلام ، ترجمة : د . محمد عناني ، رؤية للنشر ، الطبعة الاولى ٢٠٠٥ م .

## سەرچاوە کوردییەکان


١.تەفسیری ڕامان:مامۆستا ئەحمەدی کاکەمەحمود.

٢.د. مایکل هارت: ١٠٠ ناودار ، و. ئەسعەد قەرەداغی ،لە بلاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر ، چاپی دووەم ١٩٩٠

٣.فاتح سەنگاوی : بونیادە سیاسییەکانی ئیسلام ، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ ز

٤.شوان ئەحمەد: ئیسلامی سیاسی ، ٢٠٠٤ ز .

٥.درۆکانی ئینجیلی بەرنابا ،لە بلاوکراوەکانی کلێسای کورد رۆمان_سلێمانی

٦.د . کەمال مەزهەر : ڕێنیسانس ، و – فوئاد مەجید میسری ، چاپی دووەم ، خانەی وەرگێران ٢٠٠٤ ز .


## گۆڤارە عەرەبییەکان


١. مجلة الفتوى ، العدد ( ٧٩ ) رجب ١٤٢٠ هـ – تشرين الاول ١٩٩٩ م بغداد

٢. مجلة التربية الاسلامية ، العددان ( ٢٥٧ – ٢٥٨ ) السنة السادسة والعشرون ( ربيع الاول – ربيع الثاني ) ١٤١٣ هـ ( ايلول / تشرين الأول ) ١٩٩٢ بغداد

٣. مجلة التوحيد ، العدد ( ٨٨ ) السنة الخامسة عشرة ، محرم ١٤١٨ هـ – ايار ١٩٩٧ م

# رۆژنامەکان


١. رێگای یەکبوون : هۆکارەکانی ناونانی بەنو ئیسرائیل بە یەهوود ، و:عبدالله گەرمیانی،ژ/ ٨٦ ، ٢٠٠١/٤/١٦ ز .

٢. بزوتنەوەی ئیسلامی ، خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی ( جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت - فصل الدین عن الدولە ) خوێندنەوەی: عبداللە گەرمیانی ، ژمارەکانی ( ٣١١ - ٣١٢ ) لە ١٠/ ٨ / ٢٠٠٨ ز

ئەو بەرهەمانەی نووسەر وەریگێڕاوە : ژیانامەی حەسەنی کوڕی عەلی ، مێژووی دەوڵەتی ساسانی ، دڵە ڕاوکێ لە بەرگی سەردەمدا ، ڕاگواستن و ئاوەدانکردنەوە بەهاوکاری سەلاح شاکەلی و فەرهاد سەمەد ئامادە کراوە ، عێراق خوێندنەویەکی پەیوەندیە دەرەکیەکان و پەرەسەندنە ناوخۆییەکان ئامادەی چاپ.

نووسەر لەچەند دێڕێکدا : عبدالله فازل حەسەن ، ساڵی ١٩٨١ لە دێی سێ تەپانی ناوچەی زەنگاباد لە دایك بووە ، سەرەتایی وناوەندی لە ڕزگاری (سمود) تەواو کردوە ، ﴿ ٢٠٠٣ – ٢٠٠٤﴾ خوێندنی ئیسلامی لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردوە ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە ، خێزاندارو مامۆستایە لە ناحییەی (ڕزگاری).

